# حوكمڕانی و دەسەڵات

## بەرەو بنیاتنانی چەمکی گەل، دەوڵەت، بانگەواز







نوسینی : د.تەها جابر عـەلوانی

وەرگێڕانی: عومەر عەلی بێژاوایی

لە بڵاوکراوەکانی
سەنتەری زەهاوی بۆ لێکۆڵینەوەی فیکریی (٥١)

حوكمڕانی و دەسەڵات

نوسینی : د.تەها جابر عـەلوانی

و: عومەر عەلی بێژاوایی

مەبەست لەم توێژینەوە کورتە، هەوڵدانێکە بۆ دیاریکردنی واتای ئیمامەت بەو پێیەی کارێکی ئایینیە و پەیوەستە بە بنچینەکانی بیروباوەڕەوە، یاخود کارێکی دنیاییە و خەڵکی بۆ خۆیان هەڵیانبژاردووە و وای دەبینین نزیکترە بۆ بەجێگەیاندنی ئامانج و مەبەستەکانی ئایین، ئەمەش پەیوەستە بە لێوەشاوەیی و ئەزموونە بەردەوامەکانی مرۆڤایەتی.

لەم توێژینەوەیەماندا بانگەشەی ئەوە ناکەین کە دەستمان خستبێتە سەر هەموو لایەنەکانی باسەکە، بەڵکو گرفتەکەمان وروژاند و هەندێك پرسیارمان خستەڕوو، بەڵکو ببێتە هۆی جۆشدانی هزرەکان لەسەر توێژینەوەی ئەم چەمکەو چاوخشاندنەوەیەك پیایدا لەکاتێك بۆ کاتێکی تر ، بەڵام لە چوارچێوەی حوکمڕانی قورئانی پیرۆزدا، نەك لە هیچ چوارچێوەیەکی تردا.



نرخی ٢٥٠٠ دینارە

نوسەر:



تەها جابر ئەلعەلوانی

- لەدایکبویساڵی: ١٩٣٥ لە عێراق.
- خاوەنی بڕوانامەی دکتۆرا بووە لە زانستە ئیسلامییەکان، پلەی پرۆفیسیۆری لە بواری ئسوڵی فیقهدا.
- سەرۆکی زانکۆی زانستە ئیسلامی و کۆمەڵایەتییەکان بووە لە ئەمریکا – ڤێرجینیا.
- مامۆستا بووە لە زۆرێك لە زانکۆکانی جیهانی عەرەبی و ئەمریکا.
- خاوەنی دەیان کتێب و نوسینە لە بوارەکانی فیکر و رۆشنبیری ئیسلامیدا.
- بۆ ماوەی دە ساڵ سەرۆکی پەیمانگای جیهانی فیکری ئیسلامی بووە.
- لە ساڵی ٢٠١٦ لە وڵاتی میسر کۆچی دوایی کردووە.

وەرگێڕ:



- عومەر عەلی ئەحمەد.
- لەدایکبوی هەڵەبجە -١٩٦٨.
- خاوەنی بڕوانامەی بەکالۆریۆسە لە بواری ژمێریاری.
- گرنگی دەدات بەبوارەکانی فیکر و رۆشنبیری، ولەو بوارانەدا خاوەنی چەندین نوسین بابەتە.

**سەنتەری زەهاوی بۆ لێکۆڵینەوەی فیکریی:**

سەنتەرێکی کوردستانی ناحکومی ناسیاسییە، گرنگیی دەدات بە توێژینەوە و تاوتوێکردنی پرسە هزرییە بنەڕەتییەکان بۆ دووبارە هێنانە گۆی دەق و تێکستە پیرۆزەکان و چۆنیەتی دابەزاندنی چەمکە مەعریفی و بەبایەخەکانی ئیسلام لە بوارە جیاوازەکانی سەردەمدا،

**ئامانجەکانی سەنتەر: ـ**

- بوژاندنەوەی بیرو هزر و بەکارخستنی مەعریفەی ئیسلامی لە ناوەندە زانکۆیی و پەروەردەییەکاندا، بە پشتبەستن بە بەهرە و توانا خودییەکانی ئەکادیمیانی کوردستان و جیهانی ئیسلامی و ئەزموونی بیرمەندانی مسوڵمان.
- پەرەپێدان و پەسەندکردنی ڕوانگەی زانستی مەنهەجی لە چارەسەرکردنی کێشە و گرفتە هزرییەکاندا و بێلایەنبوون لە پرسە خیلافییەکاندا و خۆبەدوورگرتن لە بڕیاری پێشوەخت و شێوازی سۆزدارانە و هەوڵدان بۆ بابەتیبوون.
- کاراکردنی کەلەپووری دەوڵەمەندی ئیسلامی و سوودوەرگرتن لە سەرچاوە گرنگەکانی بیری ئیسلامی لە کۆن و نوێدا و سەرلەنوێ هێنانەگۆی چەمکە فیکرییە دوێنراوەکان لە مێژووی ئیسلامیدا، بە ڕەچاوکردنی گۆڕانەکانی سەردەم.
- پەرەپێدانی چەمکی ئیعتیدال لە کایە فیکری و مەعریفییە جیاوازەکاندا و خۆبەدوورگرتن لە تێپەڕاندن و بەزایەدان.
- سەنتەر کاردەکات بۆ سەرلەنوێ و بەردەوام خوێندنەوەی هەردوو پەڕاوی قورئان و بوونەوەر بەپێی مەنهەج و میتۆدی زانستی و بەبێ چاولێکەری، بەڵکو بە نەفەسێکی تازە و بە سوودوەرگرتن لە عەقڵی ڕاشکاو و نەقڵی سەلمێنراو.

# ناوەرۆك

## بەناوی خوای بەخشندەی میهرەبان

# پێشەکی وەرگێڕ

"د. تەها جابر عەلوانی" بە یەکێك لە بیرمەندە ناودارەکانی جیهانی ئیسلامی دەژمێردرێت و خاوەنی چەندین توێژینەوەی گرنگە، ئەم توێژینەوە کورتەیش – وەك نووسەر خۆی ئاماژەی پێکردووە – دەروازەیەکە بۆ چوونە ناو بابەتێکی زۆر هەستیاری وەك چەمکی "حوکمڕانی".. هەرچەندە بابەتی حوکمڕانی لە رواڵەتدا پەیوەندی بە ژیانی دنیای بەندەکانەوە هەیە، بەڵام بە وردبوونەوە و تێفکرین لە زۆرێك لە ئایەتەکانی قورئانی پیرۆز و کاروانی ژیانی کۆتا پێغەمبەر ﷺ و پێغەمبەران بەگشتی دەردەکەوێت پەیوەندیەکی لێکئاڵێنراوی هەیە بە هەردوو ژیانی دنیا و ڕۆژی دوایی مرۆڤەکانەوە، لە هەردوو رووی هێنانی خۆشبەختی یاخود سزا و مەینەتی، بۆیە ئەوەی زۆرێك لە خاوەن فیکر و نووسەر و وتاربێژان پێناسە و وەسفی کتێبەکەی خوای گەورە "قورئانی پیرۆز" وەك بەرنامە و پرۆگرام و کەتەلۆگ دەکەن و پێیانوایە هەڵگۆزین و هەڵێنجانی رێسا و یاساکان لە چوارچێوەی رێنماییەکانی قورئاندا و

جێبەجێکردنیان دەبێتە مایەی بەرپابوونی دادگەری لە دنیادا و سەرەنجامیش سەرفرازی رۆژی دوایی..

لە بەرامبەریشدا بەدرێژایی مێژووی مرۆڤایەتی، زۆرێك لە دەسەڵاتداران – پێدەچێت وەك سروشتێکی ئادەمیزادانە– بەرپابوونی دادگەری و عەدالەت بە جۆرێك لە کەمکردنەوەی دەسەڵاتی خۆیانی بزانن، یان وای دەبینن لەسەر حسابی بەرژەوەندیەکانی ئەوان دەبێت، یاخود دەبێت دەرەنجامی سروشتی هەوەسبازی مرۆڤەکان بێت بۆ پاوانخوازی و خواستی راکێشانی هەندێك لە ماف و دەسەڵاتەکانی خوای گەورە بۆ خۆیان، وەك لە زۆرێك لە سەرگوزەشتە قورئانیەکاندا دەربارەی ستەمکاران و فیرعەونەکان ئاماژەی پێکراوە، هەروەك ئەم ئایەتە پیرۆزەش: ﴿أرأيت من اتخذ الهه هواه﴾ ئاماژەی راستەوخۆی پێکردووە، دەسەڵاتداران و حوکمڕانەکانیش بەدرێژایی مێژوو بۆ بەدەستهێنانی ئەو خواستەیان درێغییان نەکردووە و کەسایەتی و لایەن و گرووپە ئایینی و خودی ئایینیشیان بۆ بەرژەوەندی خۆیان بەکارهێناوە و بەکاریاندەهێنن لە ڕێگای ترازاندنی زۆرێك لە چەمکەکان لە مانا و مەبەستی خۆیان، تا بیانکەنە پاڵپشتێکی تۆکمە بۆ سەقامگیرکردنی دەسەڵات و قەڵەمڕەوی خۆیان.

نووسەریش بە دید و هزری بەبڕشتی، تیشکی خستۆتە سەر چەند چەمکێکی گرنگ لەو چەمکانە و لێکدانەوە و تێڕامانی جوان و بەپێزی بۆ

کردوون، کە شیاوە ببێتە مەڵۆیەکی سەر خەرمانی کتێبخانـەی کـوردی و سەرەتایەك بۆ لێکۆڵینەوەی چڕوپڕتر و دەوڵەمەنـدتر لـە هـەر یـەکێك لـە بابەتەکان، کە لە دووتوێی ئەم پەرتووکەدا ئاماژەی پێکراوە.

ئەم کەڵە زانایەی وڵاتی عێراق، لە مانگی نیسـانی ٢٠١٦ گەڕایـەوە بـۆ سـۆز و میهـری خـوای باڵادەسـت، خـوای گـەورە لێـی خـۆش ببێـت و جێگاکەی پڕ بکاتەوە.

وەرگێڕ

عومەر عەلی بێژاوایی

٢٠١٧/١/٢٥

**پێویسته به سوپاسەوە ئاماژە بۆ ئەوە بکەم کە :**

* بـۆ مانـای ئایەتـەکانی قورئـانی پـیرۆز بـەبێ دەستکاریی "تەفسیری ئاسان"م بەکارهێناوە.

* بەهەمانشـــێوە بـــۆ دەقـــەکانی تـــەورات و ئینجیلیش پەیجی "کتێبی پیرۆز"م بەکارهێناوە.

# پێشەکی نووسەر

ئەم توێژینەوەیە زۆر ناوەستێت لەئاست شیتەڵکردنی لایەنی زمانەوانی و زاراوەیی چەمکی "حوکمڕانی"، چونکە چەمکەکان لە زاراوەکان جیاوازن، لە حاڵەتی شیتەڵکردنی هەر زاراوەیەك لە زاراوەکان لەوانەیە ئەوەندە بەس بێت کە توێژەر ریشەی زاراوەکە لە ڕووە زمانەوانیەکەیەوە دیاری بکات و زانیاریشی هەبێت دەربارەی واتا زمانەوانیەکەی، پاشان هەنگاونان بەرەو بەکارهێنەرەکانی لەلایەن ئەوانەی شارەزان لە زاراوەکاندا، لە هەموو لایەنە جۆراوجۆر و بە واتا زمانەوانیەکانیەوە، دەرەنجام –پاش ئەوە– گەیشتن بە تێڕوانینێك بۆ زاراوەکە و ئەوەی مەبەستە لێی و دەلالەتی لێ دەکات، پاشان توێژەرەکان دەتوانن لە زاراوەکەوە بگەنە جۆرێك لە دیاریکردنی ئەوەی کە لەوانەیە کۆتایی بهێنێت بە دانانی سنوورێکی کۆکەرەوە و دابڕێنەر بۆی، یاخود – لە کەمترین حاڵەتدا– یارمەتیدەربێت بۆ پێشکەشکردنی دیدێك و وێناکردنێکی روون، بەڵام چەمك – هەروەك لە حاڵەتی "حوکمڕانی خوایی"شدا هەر بەو جۆرەیە– خۆی لە ریشەیەکی فەلسەفی و فیکری و رۆشنبیری پەرش و بڵاو و فرە ئاڕاستەدا دەبینێتەوە، بەهەمانشێوە لق و ئاڕاستە جۆراوجۆرەکانیشی خۆی لە خولگە فەلسەفی و رۆشنبیرییەکەدا بە فراوانبوون یان تەسکبوونەوە دەبینێتەوە، بەڵام لە هەموو حاڵەتەکاندا پەیوەستبوونێکی پتەوی هەیە بەو بوارە مەعریفیەوە کە چەمکەکە دەیخوازێت، ئەوکات چەمکەکە پەیوەست دەکات بە سەرچاوە

مەعریفیەکەیەوە، هەروەها بە دیدە مەعریفی و فەلسەفی و مەبەستەکان، لەچوارچێوەی ئەو مەرجەعیەت و واقیعە مێژووییەدا ئەگەر لە مێژوودا پەیکەرێکی بەرجەستەی هەبێت، ئەوەشی بۆ زیاد بکرێت کە هەندێك لە چەمکە ئیسلامییەکان خەریکە لە خودی خۆیاندا ببنە کارەکتەرێك کە دەکرێت ناوی بنێین پسپۆڕی ورد، وەك لە زمانی زانستی هاوچەرخدا هاتووە، بەجۆرێك ئەگەر بویسترێت توێژینەوە و راڤەی بکرێت و بخوێندرێت بەو ئاستەی کە باسمان کرد، پێویستی بە دەیان کاژێری توێژینەوە بگرە پێویستی بە سەدانیش هەیە، بەتایبەتی ئەگەر چەمکەکە لەئاست چەمکی "حوکمڕانی خوایی"دا بێت لە دیدی ئیسلامەوە.

تا راستێتی ئەم بانگەشەیەی من روونتر ببێتەوە، دەمەوێت ئاماژە بکەم بۆ تۆڕێك لە زاراوەکان یان چەمکە لاوەکیەکان، کە چەمکی "حوکمڕانی خوایی" دەیخوازێت لەکاتی تێڕوانین و هەوڵی شیتەڵکردن بۆی، کە لە پێکهاتەکەیدا پشتی پێ دەبەسرێت و پێویستە خۆی لەو نێوەندەدا روونبکاتەوە، زۆریش گرانە – ئەگەر نەڵێین ئەستەمە– پەی ببرێت بەم چەمکە بەبێ هەرسکردنی ئەو تۆڕە و ئاگابوون لێیان، لەو چەمکانەش چەمکی ئایین، چەمکی خواپەرستی، چەمکی حوکمڕانی بە هەموو واتا جۆراوجۆرەکانیەوە، ئیتر ئەگەر بەواتا شەرعیەکەی هاتبێت، یان بە واتای تەشریعی، یاخود بە واتا عورفیەکەی، هەروەها چەمکی یەك خواپەرستن (الألوهية) و دروستکردن و پەرستش و دونیا و کۆتایی، چەمکی گوتار، حەڵاڵ و حەرام، رەها و رێژەیی، گشتی و تایبەت، شەریعەتەکان، یەکێتی ئایین، زەوی و زۆرێکی تر لە کاروبارەکان، کە

ئەستەمە پەی ببرێت بە هەموو لایەنە جۆراوجۆرەکانی ئەو چەمکانە بەبێ بوونی زانیاری دەربارەیان و ریزبەندکردنیان.

بەچاوپۆشینیش لەو جیاوازیە کە هەیە لە سروشت و ئاستی ئەو زاراوەو چەمکانەی کە دەورەدراون بە چەمکە بنەڕەتیەکانیان – ئەوەی کە ئێمە باس و توێژینەوەی بۆ دەکەین– ناتوانرێت بەتەواوی پەی ببرێت بە حەقیقەت و لێحاڵیبوون لێی بەبێ بوونی زانیاری بە ئاستێك لە ئاستەکانی ئەو زانیارییەی بۆ تێگەیشتن و توێژینەوە لەو چەمکە پێویستی دەکات. لەڕاستیدا بینیمان زۆرێك لە خەڵکی بەهەڵەدا دەچن لە بەکارهێنانی تەنها پەیوەستکردن لەنێوان ریشەی زمانەوانی کە نمایشی چەمکەکە دەکات لەگەڵ هەندێك لە جۆری بەکارهێنانەکاندا، دەرەنجام هەندێك لەوەی کە دەکرێت ناوی لێ بنێین "هۆشیاری درۆینە" بڵاوە دەکات لە کاتی وردبوونەوە لەو چەمکە، کە لەڕاستیدا ئەوە هۆشیاری نییە.

مەبەستیش لەم توێژینەوە کورتە، هەوڵدانێکە بۆ دیاریکردنی واتای ئیمامەت بەو پێیەی کارێکی ئایینیە و پەیوەستە بە بنچینەکانی بیروباوەڕەوە، یاخود کارێکی دنیاییە و خەڵکی بۆ خۆیان هەڵیانبژاردووە و وای دەبینین نزیکترە بۆ بەجێگەیاندنی ئامانج و مەبەستەکانی ئایین، ئەمەش پەیوەستە بە لێوەشاوەیی و ئەزموونە بەردەوامەکانی مرۆڤایەتی.

لەڕاستیدا ئەزموونی حوکمڕانی لە شێوەی خیلافەتکردن لەسەر ڕێبازی پێغەمبەرایەتی، راستەوخۆ لە دوای وەفاتی پێغەمبەرەوە ﷺ دەستی

پێکرد، ئەمەش لە سەردەمی خیلافەتی راشیدیندا بووە، پاشان ئەم شێوازە لە حوکمڕانی تووشی حاڵەتی کودەتای خێڵەکی بوویەوە کە زیاتر هاوشێوەی کودەتای سەربازی ئێستایە، سەرەتا بە خیلافەتی ئەمەویەکان دەستی پێکرد، دەتوانین بڵێین خیلافەتی ئەمەوی لەژێر سێبەری حوکمی حاڵەتی ناکاویدا دروست بوو، کە فیتنە گەورەکەی بەدوای خۆیدا هێناو تێوەی گلا، کە لەڕێیەوە بوویە هۆی ئاسانکاری بۆ زاڵبوونی ئاراستەی خێڵایەتی عەرەبی، تا خۆیان جێگەی دەسەڵات و بەرپرسیارێتی و دروستکردنی بڕیارەکان بگرنەوە و گۆڕانکاریی بکەن لە هۆشیاری خەڵك و ئەوانەی هەڵسوڕێنەری کاروبارەکانی خەڵکن لە ئاست چەمکی خیلافەت لەسەر رێبازی پێغەمبەرایەتی، ئەوەبوو خیلافەتی ئەمەوی لە ساڵی ١٣٢ك کۆتایی هات، کە بەشوێنیدا خیلافەتی عەباسیەکان دەستی بەسەر دەسەڵاتدا گرت، ئەویش بە هاتنی "ابی عبدالله السفاح" دەستی پێکرد و بە ئەو خەلیفە لاوازانە کۆتایی هات کە دەسەڵاتیان گرتەدەست.. لە سایەی ئەم کودەتا ترسناکانەدا زانستە شەرعیەکانیش لەدایکبوون و نووسرانەوە.

لەگەڵ ئەو کودەتا و بەلاڕێدابردنەی وێنەی خیلافەت، بۆچوون دەربارەی "هێز و دەسەڵات" سەریهەڵدا و تەشەنەی کرد، هەروەك ئاگر بەردەیتە پووش و پەڵاش، کە ئەمەش هۆکارێکی تربوو لە هۆکارەکانی قوڵکردنەوەی جیاوازییەکان لە ریزی گەلدا، لە ئەنجامدا شیعەکان بنەمای ئیمامەتیان هەڵبژارد، بنچینەیان بۆ داڕشت و کردیانە یەکێك لە بنەماکانی ئایین و وایان دانا کە پەیام و پێغەمبەرایەتی و دەسەڵات و دروستکردنی

بڕیـار، کـارانێکن کـە ناکرێـت بدرێنـە دەسـت هـیچ کەسـێك و تـەنها بـۆ خانەوادەی پێغەمبەری خوایە، ئەمەش چەندین بارودۆخ یارمەتیدەربوون، کە ئێستا لێرەدا بوار نییـە بەدێـژی بچینە ناویـەوە، بـەڵکو شـیاوترە بـە لێکۆڵینەوەیـــەکی تایبـــەت باســـی لێوەبکرێـــت، بەهەمانشـــێوەش موعتەزیلـەکان هەڵوێسـتێکی تریـان گرتەبـەر، هـەروەها خەواریجـەکان و هاوبیرەکانیان، بۆیـە شەهرسـتانی کـە خـاوەنی کتـێبی (الملـل والنحـل)ە ناهـەقی نـەبووە بڵێـت: (لـە هـەموو سـەردەمەکاندا هـیچ شمشـێرێك لـە ئیسـلامدا لەسـەر بناغـەی ئـایین ئەوەنـدە لاواز نـەبووە بـەو ئەنـدازە لاوازبوونەی کە لەسەر ئیمامەت هەبوو)[1].

ئیتر لەو بەروارەوە ئـەوەی تووشـی موسـڵمانان هـات لـە پـەرتبوون و هەڵوەشـاندنەوەی چـەمکی ئوممـەت و لەتوپـەتبوونی ئایینەکـەیان، سەرەنجام بوونە پارچە پارچە و وای لێهات هەندێك بـۆ پاڵپشـتیکردن لـە گرووپەکـەیان دەسـتیانکرد بـە دانـانی فـەرموودە و پشتبەسـتن بـە تـەئویلکردنی فـەرموودەکان بـەبێ بـوونی هـیچ ڕوویـەکی دروسـت، وەك فەرموودەی "حەفتاو سێ"کـە[2]، بـە تێڕوانینـی مـن یەکگرتنـەوە و هێـز

[1] الشهرستانی "ابو الفتح محمد بن عبدالكريم" الملل والنحل، لێکۆڵینەوەی: امـیر علـی مهنـا و علـی حسن فاعور، بەیروت، دار المعرفة، ط٣، ١٩٩٣م، ج١،ص٣١.

[2] مەبەستمان لێی فەرموودەی گرووپی ڕزگاربووەکانە: جوولەکەکان دابەش بـوون بـۆ حـەفتاو یـەك گرووپ، گاورەکانیش دابەش بوون بۆ حەفتاو دوو گرووپ، ئەم گەلـەیش دابـەش دەبـن بـۆ حـەفتاو سێ گرووپ کە هەر هەموویان لە دۆزەخدا دەبن تەنها یەك گرووپیان نەبێت، وترا: ئـەی پێغەمبـەری خوا ئەو گرووپە کامەیە؟ فـەرمووی: هەرکـەس وەك ئـەوەی مـن و هـاوەڵانمی لەسـەرە وابێـت. لـە

**ناگەڕێتەوە بۆ ئەم گەلە تا نەتوانێت سەرلەنوێ بینای هۆشیاری خۆی لەم بوارەدا بکاتەوە، بیناکردنەوەیەك کە دوربێت لە بۆچوونی حوکمڕانی خوایی و دووربێت لە بۆچوونە خێڵەکی و گرووپگەراییەکان، کە پاش تێکدانی چەمکی "خەلافەت لەسەر رێبازی پێغەمبەرایەتی" سەریان هەڵدا. بۆ هەموو ئەمانەی کە رابورد، پێویستە لەسەرمان دەست بەرین بۆ ئەم کارە مەترسیدارە لەژێر رۆشنایی قورئانی پیرۆز، کە رینوێنیکارە بۆ رێگای دروست و، هەروەها رێنوێنیکاریشە بۆ ئەوانەی کە پێی هەڵئەسن، خەڵکی هەر نموونەیەك بێنن، قورئان چاکترین و باشترین لە ئەوە دێنێت، بۆیە ئەم نامیلکەیە بۆ روونکردنەوەی حوکمڕانی ئەو قورئانە پیرۆزەیە، تا بەڵکو ببێتە چلۆسکێك بۆ رووناککردنەوەی رێگاکە بۆ کەسێك بیەوێت رێگای پێ رووناك بکاتەوە، ئەگەر سەرکەوتوو بووین لەوەی کە باسمان لێوەکردووە بۆ راستی، ئەوە ئاواتەکەی منە، خۆ ئەگەر ئەوەمان لەکیس چوو، ئەوەندەمان بەسە کە ئێمە هەوڵماندراو خۆمان ماندوو کرد، ئیتر بەڵکو خوای باڵادەست بێبەشمان نەکات لەو پاداشتەی کە دیاریکردوە بۆ ئەوانەی ئیجتیهاد دەکەن، ئەگەر پێکایان ئەوە دوو جار پاداشتیان هەیە و ئەگەریش نەیانپێکا ئەوە هەر پاداشتێکیان دەبێت.**

---

هەندێك لە گێڕراوەکاندا هاتووە: ئەوانە کۆمەڵی موسڵمانانن. بۆ گەڕانەوە بەدرێژەی باسەکەدا، بگەڕێنەوە بۆ : العلواني، طه جابر، تفكك مفهوم الأمة وضرورة المراجعة، إسلام أونلاين.نيت، ٢٠٠٥/١٢/٢٦م.

## یەکەم: پێشەوایەتی پرسێکی دنیاییە

هەر لە ساتەوەختی کۆچکردنی پێغەمەرەوە (ﷺ) بۆ شاری مەدینە و جێگیربوون تێیدا هەتا ئەمکاتەی ئێمـەی تێـداین، مشـتومڕی بـەردەوام و نەبڕاوە هەیە لەسەر ڕوونکردنەوەی سیفەتی شوێنکەوتەیی بۆ پێغەمبەری خـوا و گونجـانی ئـەوەی ئـەم سـیفەتەش بخرێتەسـەر هـەردوو سـیفەتە سـەرەکیەکە (پێغەمبەرایـەتی و پەیامـداری)، ئـاخۆ ئـەو حـوکمڕانی شارەکەیە، یان سەرکردەیەتی؟ ئایا سـەرکردەی موسـڵمانان و جگـە لـە موسڵمانانیشە، یـان تـەنها هـەر سـەرکردەی موسـڵمانەکانە؟ هـەر لەبـەر ئەوەی موسڵمانەکان زۆرینە پێکدەهێنن، ئیتر پاشماوەکانی بێبـاوەڕان و جوولەکـەکان تـەنها کەمینەیـەکن لـە کۆمـەڵگای مەدینـەدا و هیچـی تـر، ئەمەی کۆتایی، ئایا دامەزراوە لەسەر گرێبەستێکی کۆمەڵایەتی هاوسەنگ لەنێوان هەرسێ پێکهاتەکەدا کـە بـریتین لـە موسـڵمانەکان (کۆچـبەران و پشتیوانان) و جوولەکەکان و موشریکەکان، یان دانپیانانە لەلایەن هـەموو پێکهاتەکانەوە بەو سەرکردەیە و سەرکردایەتی پێغەمبەری خـوادا؟ ئـەی ئـەو ڕێکەوتنـە چـی لێکەوتـەوە؟ ئایـا دەوڵـەتێکی لێکەوتـەوە هـەروەك هەنـدێك وایـان پـێ خۆشـە بـەو شـێوەیە نـاو ببرێـت، یـان کۆمەڵگایـەکی هاوسـەنگ بـەجۆرێك لایەنـەکانی لەسـەری ڕێککـەوتوون بـۆ پێکهێنـانی کۆمەڵگایەك کە هەریەکێك لەو سێ لایەنە وابەستە بـن بـە دوو لایەنەکـەی تـرەوە، ئـەویش بەکۆمـەڵێك پەیوەسـت و ڕایەڵـە کـە وایـان لێ دەکـات بەرپرسبن لە ئاسایش و پاراسـتنی ئـەو کۆمەڵگایـە و بـەرگریکردن لێـی و

ڕێکخستنی کاروبارە جۆراوجۆرەکانی لە ڕووی رامیاری و ئابووری و کۆمەلآیەتیەوە؟

هەموو ئەم پرسیارانە و –جگە ئەمانە زۆرێکی تریش– لە کاتێك بۆ کاتێکی تر دەوروژێنران، بە وەلآمگەلێکی جۆراوجۆریش وەلآم دەدرانەوە، بەلآم زانایان – ئەوانەی بە زانایانی جمهوور، یان زانایانی زۆرینەی خەڵك ناوبانگیان دەرکردبوو، لە پرسە رامیارییەکانیش شتیان دەنووسی– وایان پێ چاکتربوو نازناوی دەوڵەت بنێن لەو جۆرە ڕێکخستنەی کە بە سەرکردایەتی پێغەمبەر لە مەدینەدا ڕوویدا، بەهەمان شێوە ئەوانەی دوای ئەمانیش هاتن هەر بۆچوونیان وابوو ناوی دەوڵەتی لێبنرێت، ئەوەتا "امام الحرمین" لە کتێبی "الغیاثی" ئاڕاستەی خواستی ئەویش بەرە و ئەوەبووە، "ماوەردی"یش لە کتێبی "الأحکام السلطانیة" و کتێبی "أدب القاضي" و هەروەها لەکتێبی "الحاوي"یشدا هەرهەمان بۆچوونی دەرخستووە، بەهەمان شێوە "ئەبو یەعلی"و پاشان "ئیبن تیمیە"یش لەسەر هەمان بۆچوون بوون.

قەڕافی لە کتێبەکەی خۆیدا "الإحکام في تمییز الفتاوی عن الأحکام وتصرفات القاضي والإمام"دا، هەوڵیداوە جیاوازیی بکات لەنێوان ئەو کردارانەی پێغەمبەری خوا ﷺ کە جۆرێك لە شێوازی سیاسی و کارگێڕی پێوەیە و لە نێوان ئەو کردار و کردەوانەی کە دەکرێت لێیانەوە وەك شێوازێك بۆ فێرکردنی خەڵك و چۆنێتی شوێنکەوتنی قورئانی پیرۆز بێت، وەك هەنگاونانێك بۆ جێبەجێکردنی ئایەتەکان لە ژیانی رۆژانەدا، بەوپێیە

پێغەمبەر ﷺ دێتە پێش وەك سەرمەشق و پێشەنگێك تا خەڵك چاوی لێبکەن، بەڵام هەندێك لە زانایان وا دەبینن کە ئەوەی پێغەمبەر ﷺ پێی هەڵساوە لە جێبەجێکردنی سزا و حوکمەکاندا و سەرکردایەتیکردنی سوپا جۆرێك نیبە لە زیادە ئەرکێکی سیاسی، بەڵکو یەکێکە لە کارە هەرەگرنگەکانی پێغەمبەری پەیامدار ﷺ، لە راستیدا زۆرینەی هەرەزۆری پێغەمبەرانیش– پێش پێغەمبەرمان– حوکم و زانستیان پێدراوە، حوکمەکە جێبەجێکردن و شوێنکەوتن و پێشکەشکردنی سەرمەشقێکی جوانی تێدایە کە پێویستن بۆ مرۆڤایەتی و، خەڵك ئاتاجیان پێی دەبێت لەکاتی بەجێگەیاندنی کاروبارە جۆراوجۆرەکانی ژیاندا، کە کەسایەتی پێغەمبەری خوا ﷺ– بەو سیفەتەی کە کۆتا نێردراوی خوایی و هەڵگری کۆتا پەیامی جیهانییە –، بۆیە دەبێت سەرمەشقێکی هەمەلایەنە پێشکەش بکات بۆ هەموو مرۆڤایەتی، بۆیە ژنهێنانی و هەڵسوکەوتی لەگەڵ هاوسەرەکانی، خەڵکی فێرکرد کە چۆن هەڵسوکەوت بکەن لەگەڵ هاوسەرەکانیان و چۆنیەتی دامەزراندنی خێزان و گرەنتی پاراستنی، تا ببێتە تۆوی بنیاتنانی کۆمەڵگا، هەروەها سەرکردایەتیکردنی سوپا– لە سی و پێنج غەزوەدا لە کاتی پێغەمبەرایەتیدا، – مەبەست لێی فێرکردنی ئەو کەسەیە کە بەرەورووی سەرکردایەتیکردنی سوپایەك دەبێتەوە، پاشانیش ئامادەسازی و خۆ بەهێزکردن بۆ بوونە سەرکردە و پێشکەشکردنی نموونەیەکی جوان کە رێگا خۆشدەکات بۆی، تا ببێتە سەرمەشق بۆ سەربازەکانی لە کاتی جەنگ و ئاشتیدا بەگوێرەی رێنماییەکانی پێغەمبەری خوا، بەهەمانشێوە

کاتێك کاروبـاری دادوەرییکردنـی لـەنێو خەڵکدا گرتـە دەسـت، ئامـانجی ئەوەبوو تا ببێتە سەرمەشق بۆ دادوەرەکانیش، هەروەها خودی خۆی کە ڕۆڵی داواکار و داوا لەسەرکراوی دەبینـی، بـۆ هـەمان مەبەسـت بـوو، بـە هەمانشێوە حاڵەتەکانی تری وەك قـەرزاربوون و وەفـاکردن بەئەمانـەت و گرەنتیدان و زۆر شتی تریش، هەموو ئەمانەی کە کاری لەسەر دەکرد، بۆ جێبەجێکردنی حوکمەکان بوو، یان بۆ فەرمانکردن بوو بە لەبەرچاوگرتنی سـنوورەکان، یـان فـەتوادانبوو بـۆ خـەڵکی، هـەموو بوارەکـانی ژیـانی پێغەمبـەر ﷺ بریتـی بـوون لـە پێشکەشـکردنی وێنایـەك لـە لوتکـەدا، سەرمەشق و پێشەنگێکی جـوان و چـاك، بـەڵام ئەمانـە هیچـیان بـەزیادە ئەرك هەژمار ناکرێن یان نابنە سیفەتێکی زیـادکراو بـۆ سـەر دوو سـیفەتە بنەڕەتیەکـە (پێغەمبەرایـەتی و پەیامـداری)، بـەڵکو ئەمانـە هـەر ئـەو سیفەتانەن کە قورئان باسیان لێوەدەکات دەربارەی پەیامی پێغەمبەران: ﴿أُوْلَئِكَ الَّذِينَ هَدَى اللَّهُ فَبِهُدَاهُمُ اقْتَدِهْ قُل لاَّ أَسْأَلُكُمْ عَلَيْهِ أَجْرًا إِنْ هُوَ إِلاَّ ذِكْرَى لِلْعَالَمِينَ﴾ (الأنعام: ٩٠) واتە: {ئەو پێغەمبەرانەی کە باسکران، ئەو کەسانەن کە خوای گەورە بەتایبەتی هیدایەت و ڕێنمونی کـردوون، تـۆش ئـەی محمـد ﷺ ئـەی ئیمانـدار، شـوێنی هیدایـەت و ڕێنمـونی ئەوانـە بکـەوە}، سـەبارەت بـە هـەموو ئەوانـەیش کـە دوای ئـەو دێـن خـوای باڵادەست دەفەرموێت: ﴿لَقَدْ كَانَ لَكُمْ فِي رَسُولِ اللَّهِ أُسْوَةٌ حَسَنَةٌ لِّمَن كَانَ يَرْجُو اللَّهَ وَالْيَوْمَ الْآخِرَ وَذَكَرَ اللَّهَ كَثِيرًا﴾ (الاحزاب: ٢١) واتـە: {لەڕاسـتیدا چاکترین مامۆستا و ڕابەر پێغەمبەری خوایە ﷺ بۆ سەرجەم ئیمانداران، بەتایبەت بۆ ئەوانەتان کە مەبەستیان بەدەستهێنانی ڕەزامەندی خوایە و

به ئومێدی پلە بەرزەکانی بەهەشتن و دەیانەوێت زۆر یادی خوای گەورە بکەن لە هەموو کات و ساتێکدا}.

بینا لەسەر ئەوە، ئەو هەڵسوکەوتانە هەمووی بەمەبەستی بنیاتنانی ئەرکێکی نوێی پێغەمبەرایەتی نەبووە، بەڵکو تەنها روونکردنەوەی چۆنێتی پێشکەشکردنی سەرمەشقێك بووە بۆ مرۆڤایەتی لە بەرزترین ئاستداو لەلایەن کەسانێك کە خوای گەورە پاڵاوتوونی تا ببنە پەیامهێنەری مزگێنیدەر و بەئاگاهێنەرەوە، بۆ ئەوەی مرۆڤایەتی شوێنیان بکەون و ماندوونەناسانە کار بکەن بۆ هەڵگرتنی شوێنپێکان، یان لەکاتی بەجێگەیاندنی کاروبارە جۆراوجۆرەکانی ژیاندا، لەهەمانکاتیشدا تا ببێتە بەڵگە بەسەر هەموو مرۆڤایەتیەوە بەوەی هەموو ئەو فەرمانانەی خوای گەورە بڕیاری لەسەرداون لە پەیڕەوکردنی عەدالەت لە کاتی حوکمکردن لەنێوان خەڵکیدا و یەکسانی و گەڕاندنەوەی ئەمانەت بۆ خاوەنەکەی و کارکردن بە گشت ئەو بەها قورئانییانەی کە خوای گەورە و باڵادەست ناردوونی، هەموو ئەمانە لە کاتی شوێنکەوتنی پێغەمبەراندا مرۆڤەکان لە توانایاندایە بە تەواوترین و چاکترین شێوە، پێی هەستن.

بە لەبەرچاوگرتنی ئەوانەی ڕابوورد، کتێبەکانی مێژوو پڕن لە زۆرێك لەو باسانەی کە هاوشێوەن لەگەڵ ئەو باسانەی کە مێژوونووسان[1]

---

[1] ابن هشام، أبو محمد عبد الملك. السيرة النبوية، بەيروت: دار الجيل، ١٩٧٥، ج٤، ل ٢٢٥ — ٢٢٧. هەروەها سەيری: ابن كثير، أبوالفداء اسماعيل. البداية والنهاية، بيروت: دار المعرفه، ١٩٩٧، ج٥، ل

باسیان لێوه کردووه لەوەی کە لە "سەقیفەی بەنی ساعیدە" لە نێوان سەرکردەکانی کۆچبەران و پشتیوانان دەگوزەرا، خۆ ئەگەر بەناسکی سەیرێکی هەموو ئەو ڕیوایەتانە بکەین، دەبینین هەموو ئەوانە گوزارشتن لە لایەنێك لە لایەنەکانی ئەو سیفەتانەی کە کەسایەتی پێغەمبەر ﷺ بۆی جێهێشتوین، ئەویش لایەنی سەرکردە و دەسەڵات و سیاسەتە، ئایا دەکرێ لایەنەکانی تری فەرامۆش کردبێت؟ لەڕاستیدا ئەوەی لە ئاییندا بەپێویست گیراوە ئەوەیە کە پێغەمبەرایەتی و پەیام کۆتاییان پێهاتووە و پێغەمبەریش کۆتا پێغەمبەر و نێردراوە، نە نێردراو و نە پێغەمبەر بەدوایدا نایەت، هەر ئەویشە کتێبی خوای بۆ خەڵك بەجێهێشتووە ئەگەر دەستبگرن بەو مەبەست و بەها و خواستانەی کە تێیدایە هەرگیز پاش ئەو سەریان لێ تێك ناچێت، پێغەمبەریش ﷺ جەختی لەوە کردووەتەوە کاتێك داوایان لێکرد نووسراوێکیان بۆ بنووسێ تا پاش وەفاتی لەسەری بڕۆن، وەڵامی ئەوەبوو فەرمووی: شتێکم بۆ بەجێهێشتوون ئەگەر پابەندبن پێوەی هەرگیز پاش من سەرلێشێواو نابن: ئەویش کتێبەکەی خوای گەورەیە[١]، هەر ئەم بۆچوونەش دەگونجێت لەگەڵ ئەم ئایەتەی خوای باڵادەست: ﴿إِنَّمَا أُمِرْتُ أَنْ أَعْبُدَ رَبَّ هَذِهِ الْبَلْدَةِ الَّذِي حَرَّمَهَا وَلَهُ كُلُّ شَيْءٍ وَأُمِرْتُ أَنْ أَكُونَ مِنَ الْمُسْلِمِينَ * وَأَنْ أَتْلُوَ الْقُرْآنَ فَمَنِ اهْتَدَى فَإِنَّمَا

---

٢٥٧ –٢٦٢، بکە، هەروەها سەیری ڕووداوی سەقیفە لە سەرچاوەکانی تردا بکە، وەك: "تأريخ الطبري"، "الكامل" ابن الاثير، "تأريخ الإسلام" ی ئیمامی زەهەبی".

[١] ابن حنبل، أبو عبدالله أحمد. فضائل الصحابة، لێکۆڵینەوەی: وصي الله محمد عباس، بيروت، مؤسسة الرسالة: ١٩٨٣، ج١، ل ١٧١.

يَهْتَدِي لِنَفْسِهِ وَمَن ضَلَّ فَقُلْ إِنَّمَا أَنَا مِنَ الْمُنذِرِينَ﴾ (النمل: 91–92)
واته: {لەڕاستیدا منی پێغەمبەر فەرمانم پێدراوە کە پەروەردگاری ئەم ناوچەیە بپەرستم کە سنووری بۆ داناوە و ڕێزی لێگرتووە و (لە هەندێ جار و هەندێ مانگ و هەندێ حاڵەتدا) هەندێ شتی حەڵاڵی تێدا حەرام کردووە، هەموو شتیش هەر بەدەست ئەو زاتەیە، وە من فەرمانم پێکراوە لە ڕیزی مسڵمانانندا بم... (ئەوانەی کە لە هەڵسوکەوت و کار و کردەوەکانیاندا تەسلیمی خواوەندی خۆیانن)، هەروەها فەرمانم پێدراوە کە دەوری قورئان بکەمەوە، جا ئەوەی ڕێبازی هیدایەت و دینداری دەگرێتەبەر، ئەوە قازانجی هیدایەت و دینداریەکەی بۆ خۆیەتی، ئەوەش کە ڕێبازی گومڕایی دەگرێتە بەر ئەوە هەر خۆی زەرەر دەکات، هەردەم بەو جۆرە کەسانە ڕابگەیەنە کە کاری من بێدارکردنەوە و هۆشیارییدانە} .

دەگێڕنەوە کۆمەڵێك وتیان بە عەلی کوڕی ئەبو تالیب (خوا لێی رازی بێت) ئەی گەورەی باوەڕداران ببە بە خەلیفە، وتی نەخێر، بەڵکو بەجێی دەهێڵم بۆ خۆتان هەروەك پێغەمبەری خوا ﷺ بەجێیهێڵا بۆ دوای خۆی – واتە بەبێ دەستنیشانکردنی خەلیفە ـ، ئەگەر خوای گەورە چاکەی بۆ ئێوە بوێت ئەوا لەسەر چاکترینتان کۆتان دەکاتەوە، هەروەك چۆن پاش وەفاتی پێغەمبەر خوای گەورە کۆیکردنەوە لەسەر چاکترینتان[1].

[1] ابن كثير، أبو الفداء إسماعيل بن عمر. البداية والنهاية. لێكۆڵینەوەی: عبدالله بن المحسن التركي، القاهرة: هجر للطباعة والنشر، ١٩٩٨، ط١، ج١١، ل١٣١

ئەمەش ئاماژەیە بۆ ئەو سەردەمەی کە هاوەڵان داوایان دەکرد لە پێغەمبەری خوا کە با هەر خۆی پەیمانێکیان بداتێ بە دانانی جێنشین بۆ بەڕێوەبردنی کاروباری سیاسی پاش وەفاتی خۆی، پێغەمبەریش ﷺ ویستی ئەمە بکاتە دەرفەتێك تا دووپاتی ئەو ئامانج و بەهایانە بکاتەوە کە قورئان لەخۆی گرتوون، نەك لە ئامانجگرتنی کەسەکان و گرووپەکان، بە لەبەرچاوگرتنی مەترسیی دەرکەوتنەوەی رەگەزگەرایی و هاوشێوەکانی لەو سەرەتا نزیکەدا کە دەبوویە هۆی گەڕانەوەی خەڵك بۆ ئەو نەریتە، ئەوکات بەهاو ئامانجەکان لەبیر دەکران، خۆ ئەگەر پێغەمبەری خوا دەقێك، یاخود وەسیەتێك، یان ئاماژەیەکی بەجێهێشتبایە بۆ ئەوانەی دوای خۆی، یان ئەو کەسەی کە شیاوترە پاش خۆی ببێتە خەلیفە، ئەوا ئەو باس و خواس و وتووێژەی کە لە سەقیفەی بەنی ساعیدە، یان لە دەرەوەی سەقیفەدا روویدا، دەگەشت پێمان، زیاد لەوەش دەبووە دەوڵەمەندترین باس و خواسی ئەو کاتە، بەڵام نەبوونی هیچ ئاماژەیەکی لەو جۆرە، بەڵگەیە لەسەر ئەوەی کاروباری جێنشین و سەرکردایەتی سیاسی بەجێهێڵراوە بۆ ئەو گەلەی کە ڕێنمایی وەرگرتووە لە قورئان و سوونەت و ڕەوشتی پێغەمبەرەوە، بەجۆرێك گرەنتی ئەوەی لێ کراوە کە گەشتۆتە ئاستێکی پێگەیشتووی ئەوتۆ کە بڕیار لەو بارەیەوە لە میللەت وەربگرێت بەبێ ئاتاج بوون بە وەسیەت، بۆ ئەوەی ئەم پرسە لە بازنەی بەرژەوەندی باڵای گەل و ئامانجە شەرعی و قورئانیەکان و بەها و خواستەکاندا بمێنێتەوە.. لەبەرئەوەی قورئان لەڕێی ئایەتەکانەوە هۆشیاری لەنێو هەموو رۆڵەکانی گەلدا

بڵاوکردووەتەوە، بۆیە مانا و مەبەستی داد، ئەمانەت، شوورا، چاکە، خراپە، گەل، یەکتاپەرستیی، پارێزکاریی، ئاوەدانکردنەوە، بانگەواز، بەرزکردنەوەی وشەی خوا فێربوون و بەرهەڵستی لە بڵاوبونەوەی خراپە دەکەن و گەمارۆی دەدەن و بەرتەسکی دەکەنەوە تا زیان نەگەیەنێ بە هیچ پارچەیەکی ئەم زەویە و هیچ گرۆیەك لە دانیشتوانەکەی، هەموو ئەمانە دەستکەوتێکی تەواون بۆ بەدەستهێنانی رایەکی گشتی و رۆشنبیرییەکی هاوبەش لای خەڵك تا بتوانێت سیستەمێکی دادپەروەر و پێگەیشتوو و هەڵبژێردراو لەلایەن گەلەوە فەراهەم بهێنێ.

ئالێرەوە، ئەم دەقەی قورئانی پیرۆز ﴿**لِكُلٍّ جَعَلْنَا مِنكُمْ شِرْعَةً وَمِنْهَاجًا**﴾ (المائدة: ٤٨) ئاماژەیە بۆ بەشدار بوونی گەل لە شەریعەت و پرۆگرامدا، چونکە ئایەتەکە بەم شێوەیە نەهاتووە: (لِكُلٍّ مِنكُمْ جَعَلْنَا شِرْعَةً وَمِنْهَاجًا) بۆ هەر یەکێك لە ئێوە شەریعەت و پرۆگرامێکمان داناوە، تا ئەوەی لێوە تێبگەین کە بۆ هەر گەلێك شەریعەت و پرۆگرامێك هەبێت، بەڵکو ﴿لِكُلٍّ جَعَلْنَا مِنكُمْ شِرْعَةً وَمِنْهَاجًا﴾ هەروەك ئەوەی شەریعەت و پرۆگرام لە ئێوەدا کۆکرابێتەوە، تا وەڵامدەرەوەی پێداویستیەکانتان بێت و بتوانن کاروبارەکانی رۆژانەتان بەبێ بارگرانی لە سایەی ئەو شەریعەت و پرۆگرامەدا بەڕێ بکەن و بەبێ ئەوەی بەزۆر بسەپێ بەسەرتاندا کە ئەو کات ماناکەی وای لێ دەهات: (لكل عليكم)، بەڵکو فەرموویەتی (لكل منكم)، هەروەك ئەوەی لێتان وەرگیرابێت و پاشان درابێتەوە پێتان !

هەر لێرەوە ئیجتیهادکردن بە دەرکەوت و شەرعیەتی وەرگرت و بوویە ئـــەرکێکی گــرنگ و پێویســـت لەســـەر موجتەهیــدەکان لــە بوارەکــانی جێبەجێکردن و شەریعەتدا و پڕکردنەوەی ئەو بۆشاییە تەشـریعیە، بۆیـە شەریعەتی قورئان خاڵیە لە ئەرکێك کە لە تواناداا نەبێت، یان قورسبێت و ببێتە مایـەی بـارگرانی: ﴿لاَ يُكَلِّـفُ اللّـهُ نَفْسًـا إِلاَّ وُسْـعَهَا﴾ (البقـرة: ٢٨٦) واتــە: {لەڕاسـتیدا خـوای گـەورە داخـوازی لەتوانابـەدەری نییـە و ئـەرك ناخاتە سەر هیچ کەس کە لـە توانـا و هێـزی بـەدەربێت}، هـەروەها ﴿لَـا يُكَلِّفُ اللَّهُ نَفْسًا إِلَّا مَا آتَاهَا سَيَجْعَلُ اللَّهُ بَعْدَ عُسْرٍ يُسْرًا﴾ (الطلاق: ٧) واتە: {خـوای گـەورە بـەگوێرەی توانـای هەرکەسـێك داوای بەخشـین دەکـات، دڵنیـاش بـن کـە خـوای گـەورە دوای تەنگانـە هـەرزانی دەهێنێـت، دوای ناخۆشی خۆشی دەهێنێت}، ﴿يُرِيدُ اللّـهُ أَن يُخَفِّـفَ عَـنكُمْ وَخُلِـقَ الإِنسَـانُ ضَعِيفًا﴾ (النساء: ٢٨) واتـە: {بـەڵام خـوای گـەورە هـەر دەسـتبەدارتان نابێـت، بـەڵکو دەیـەوێت بـەهۆی ئـەم قورئانـەوە، ئـەم ئاینـە پـیرۆزەوە کارئاسانیتان بۆ بکات، تەوبـە لەوانـە وەربگرێـت (کـە قـوڕاوی و تـۆزاوی بوون بەهۆی تاوان و گوناهەکانیانەوە)، چونکە بە سروشت ئادەمیزاد بـە لاوازی دروستکراوە (خۆڕاگرنیـە لـە بەرامبـەر ئارەزووەکانیـەوە، زۆرجـار نەفس و شەیتان تووشی گوناهو هەڵەی دەکەن}، ﴿وَمَا جَعَـلَ عَلَـيْكُمْ فِـي الدِّينِ مِنْ حَرَجٍ﴾ (الحج: 78) واتە: {..وە لەم ئاینەشدا هیچ شتێك بەدی ناکەن کە مایەی شەرمەزاری و ناڕەحەتی بێـت..}، دەبینـین هـەموومان هەگبەمان پڕە لە لاوازی، هێز، گەنجی، پیری، بۆیە ناکرێت تێبینیەکان بە پڕاوپڕی دەربکەوێت، تەنها لای خوای بەسۆز و شارەزا نەبێت، هەر خۆی

هەقی ئەوەی هەیە بفەرمووێت ئەم شەریعەت و پرۆگرامە بۆ ئێوەیە نەك لەسەر ئێوەیە، هەر لەمبارەیەوە ئایەتی تریش هەیە وەك: ﴿يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُواْ أَطِيعُواْ اللّهَ وَأَطِيعُواْ الرَّسُولَ وَأُوْلِي الأَمْرِ مِنكُمْ﴾ (النساء: ٥٩) واتە: {ئەی ئەو کەسانەی ئیمان و باوەڕتان هێناوە هەمیشە و بەردەوام فەرمانبەرداری خوای گەورە و فەرمانبەرداری پێغەمبەر و ئەو بەرپرسانە بکەن کە لە خودی خۆتانن}، بۆیە قۆرخکردنی دەسەڵات و خۆسەپاندن نادروستە و ڕێگەپێدراو نییە، چونکە بەو حاڵەیەوە لەو بازنەیە دەردەچێت کە لە ئێمە بێت (منا)، بەڵکو دەبێتە لەسەرمان (علينا)، لەکاتێکدا خوای گەورە ڕێز و سەربەرزی بۆ بڕیار داوین: ﴿**وَلَقَدْ كَرَّمْنَا بَنِي آدَمَ**﴾ (الاسراء: ٧٠) واتە: {لەڕاستیدا ئێمە ڕێزمان گرتووە لە نەوەکانی ئادەم}، هەروەها فەرموودەی خوای بالادەست: ﴿وَلِلَّهِ الْعِزَّةُ وَلِرَسُولِهِ وَلِلْمُؤْمِنِينَ وَلَكِنَّ الْمُنَافِقِينَ لَا يَعْلَمُونَ﴾ (المنافقون: ٨) واتە: { عیززەت و دەسەڵات و پایەداری هەر شایستەی خوای گەورەیە بە پلەی یەکەم، پاشان شایستەی پێغەمبەرەکەیەتی ﷺ بە پلەی دووەم، ئینجا شایستەی ئیماندارانە لە هەموو زەمان و زەمینێکدا بە پلەی سێیەم، بەڵام دووڕووەکان نازانن}، خوای گەورە ئەوەی بۆ بەڕەوا نەبینیوین کەسانێك زاڵ بکات و بیەوێت خۆی بسەپێنێت و دەستدرێژی بکاتە سەرمان.

ئەگەر بگەڕێینەوە بۆ سەرەتا، لە وتووێژەکانی سەقیفەدا بنچینەیەك دەبینین جۆرێك لەدەستدانی هاوسەنگی پێوە دیارە، کە ئەویش دەرەنجامی ئەو کاریگەریە گەورەیەی وەفاتی پێغەمبەر بوو ﷺ، بووە

هۆی ئەوەی ئەو نەوە پاك و پاڵفتەیـە تووشـی سەرسـامی و حەپەسـان و شڵەژان بكات، بەتایبەت ڕووداوی سەقیفە – وەك دەردەكـەوێت– ڕۆژێـك پاش وەفاتی پێغەمبەر بووە، دەكرێت بوترێـت لـەو سـاتەوەختەدا تـرس سـەراپای هـەموانی داپۆشـی بـوو، لـە پـاڵ بـوونی دووڕووەكـان و شڵەژاوەكاندا، كە كاریان بۆ قۆستنەوەی فرسـەت ئـەكرد تـا دڵەڕاوكـە و پشێوی بنێنەوەو ئەوەی پێغەمبەر بنیاتی ناوە لـە مـاوەی بیسـت و سـێ ساڵدا ئـەوان تێكـی بشـكێنن، ویسـتیان بـە فووەكانیـان ڕۆشـنایی خـوا بكوژێننەوە، ئەوەبوو ئەو هەموو هاتووهاوارە تـەنها مشـتومڕێكی دنیـایی بـوو كـە بریتـی بـوو لـە ململانێـی گرتنەدەسـتی دەسـەڵات و جۆرێـك لـە تێڕوانین كە ئیسلام هەر لە سـەرەتای هەڵهاتنیـەوە تێكیشـكاندووە، خـۆ ئەگەر لەو گفتوگۆ و وتووێژانەشدا سەری دەرهێنابێت، ئەوە ئاماژەیە بـە حاڵـەتێكی نـەخوازرا و یـاخود سروشـتی، زۆرێكـی تـریش لـە ئامـاژە و دەلالەت كە پێغەمبەر ﷺ چاندبووی لە ناخیاندا، یاخود قورئـانی پـیرۆز لە عەقڵ و هزریاندا ڕواندبووی كە ئێمە نـاتوانین پـەییان پێبـەرین، لەبـەر هەموو ئەمانە، ئەو حیوارەی سەقیفەی بەنی ساعیدە، زۆرتر پێویستی بە بەدواداچـوون و وردبوونـەوە هەیـە لەلایـەن زانایـان و خـاوەن بۆچوونەكانەوە، تاوەك ئەو نەوە پاك و چاكە شتێك نەدرێتە پاڵیـان كـە شایان بەوان نەبێت، بەو پێیەی ئەوان ئەو نەوەیـەن كـە پـاش پێغەمبـەر ﷺ شەرەفی بوونە شاهیدییان بەسەر خەڵكەوە پێ بەخشراوە.

گفتوگۆكـەی سـەقیفە ئەگـەر بـەو شـێوەیەی كـە بۆمـان نـەقڵ كـراوە ڕاستبێت، ئەوە بەڵگەیەكی روونە لەسەر ئـەوەی یەكـەم نـەوەی هـەڵگری

پەیام "واتە هاوەڵانی پێغەمبەر" وا تێنەگەیشتبوون کە پێغەمبەر ﷺ نێردراو و خاوەن پەیام و سەرکردەیەکی سیاسی و نەتەوەیی بێت، لە هیچێك لەو وتووێژانەدا شتێکی لەو بابەتە دەرنەکەوتووە، نە کۆچبەران و نە پشتیوانان شتێکی لەو جۆرەیان لێوە بەدەر نەکەوتووە، خۆ ئەگەر بەو جۆرە لێی تێبگەیشتنایە، دەبوو یەکێکیان بە بەڵگە بیهێنایەتەوە لەوەی کە دەیانویست، بەڵام هیچ شتێکی لەو جۆرەمان نەبینیوە، بەڵکو تەنها خاڵێکی هاوبەش لە نێو وتووێژکاراندا دەبینین ئەویش پێویستبوونی پاراستنی هەموو دەستکەوتەکانی سەردەمی پێغەمبەرایەتی بوو لەو کۆمەڵگا هەماهەنگیەدا و کەمتەرخەمی نەکردن لە ئاست هیچکام لەو دەستکەوتانە، پێغەمبەریش ﷺ هەروەك چۆن پرۆگرامێکی بۆ جێهێشتووین تا ببێتە سەرمەشقمان لە بەجێگەیاندنی نوێژ و زەکاتدان و رۆژووگرتن و حەجی ماڵی خوا، بەهەمانشێوە پەیڕەوێکی بۆ دیاری کردووین تا ببێتە سەرمەشقمان لە چەسپاندنی دادگەری و یەکسانی لە نێوان مرۆڤەکان و گەڕاندنەوەی ئەمانەت بۆ خاوەنەکەی و پاراستنی ئامانجەکانی شەریعەت و چۆنیەتی سەرخستنی لاوازەکان و پاراستنی مافەکان و جێبەجێکردنی ئەرکەکان.

لەبەر ئەوە دەبینین هەر چوار خەلیفەکە پابەند نەبوون بەهەموو ئەوەی کە دەربڕدرابوو لە گفتوگۆکەی سەقیفەدا، هەر دوو بەڕێزان ئەبوبەکر و عومەر– خوا لێیان رازی بێت– پابەند نەبوون بە هەموو ئەو پێشنیارانەی کە لە وتووێژی سەقیفەدا باسکرابوو، بەڵکو تەبابوون لەسەر پابەندبوون بە یەك پرس – هەروەك ئەوەی خۆی

حەشاردابێت لە ناخی هەردووکیاندا– ئەویش بریتی بوو لە خیلافەتکردن لەسەر ڕێبازی پێغەمبەرایەتی، خۆ ئەگەر ئەم ناونیشانە شیتەڵ بکەین، دەبینین ئەوەی هەر چوار خەلیفە پێوەی پابەندبوون خیلافەتکردن بوو لەسەر ڕێبازی پێغەمبەرایەتی، کە ئەویش جێگرتنەوەی پێغەمبەری خوا لە ناو گەلەکەیدا بە ڕێکارێك کە نزیکبێت لە ڕێکارەکەی ئەوەوە بەگوێرەی پەیڕەوێکی تۆکمە، کە هەر چوار خەلیفە وایاندەبینی ئەوە پەیڕەوی پێغەمبەرایەتی کردنە، ئەمەش بەرجەستەکردنی کرۆکی ئەو بەها باڵایانەیە کە لە قورئانی پیرۆزدا هاتوون، کە خۆی دەنوێنێت لە دادپەروەری، یەکسانی، سەرخستنی لاوازەکان، چەسپاندنی سنوورەکان، پارێزگاریکردن لە ئەمانەت، پاراستنی یەکێتی گەل و ئەو شتانەی کە گرنگ و پێویستن بۆی، خۆ ئەگەر خەلیفە نەگەیشت بەو ئاستە، پێویستە هەوڵبدات، چونکە گەل بەکەمتر لەوە رازی نابێت، ئەوەبوو گەل هۆشیارییان هەبوو بەرامبەر ئەو راستیە و بە ئەبوبەکریان دەوت خەلیفەی پێغەمبەری خوا، کاتێکیش خیلافەت کەوتە لای عومەر و نازناوەکە درێژ بوویەوە و بوو بە "خەلیفەی خەلیفەی پێغەمبەری خوا"، ئەوەبوو کۆبوویەوە لەگەڵ موسڵماناندا و ئەم کارەی لەگەڵدا تاوتوێ کردن تا گەشتنە نازناوی "أمیر المؤمنین"، (وشەی) ئەمیر (ئەگەرچی دەلالەتێکی سیاسیشی هەیە، بەڵام پێغەمبەری خوا ﷺ لە چوارچێوەی ڕێکخستنێکی بێ لایەندا دایناوە، ئەو دەلالەتە سیاسیەی کە لە دواییدا پێوەی ناسرابوو ئەو لێی داڕنیبوو، هەر بۆیە لێیەوە ڕیوایەت کراوە کە فەرموویەتی: (ئەگەر سیان لە ئێوە چوونە سەفەر با یەکێکتان ببێتە

ئەمیر)، [1] کەواتە بەرپرسیارێتی لێرەدا پرسێکی رێکخستنە بەسەر بەرپرسەکەدا دەسەپێت تا کاروبارەکانیان رێکبخات – گەلێك بن یاخود

---

[1] لە ئەبو سەعیدی خودریەوە دەگێڕنەوە: کە پێغەمبەر ﷺ دەفەرمێ: هەر سێ کەسێك لە ئێوە دەرچوون بۆ سەفەر با یەکێکتان ببێتە ئەمیرتان، ئەبو داود ڕیوایەتی کردووە (٢٧٠٨)، هەروەها ئەبو هورەیرەش ڕیوایەتی کردووە: کە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: ئەگەر سێ کەستان لەسەرفەردابوون با یەکێکتان ببێتە ئەمیر، نافیع وتی: وتمان بە ئەبو سەلەمە: تۆ ئەمیرمانی، ئەبو داود ڕیوایەتی کردوە بەژمارە (٢٧٠٩) سەنەدی فەرموودەکەش لەڕێگەی محەمەدی کوڕی عەجلانەوەیە، جارێك لە نافیعەوە لە ئەبو سەلەمەوە لە ئەبو سەعیدی خودریەوە، جارێکی تریش لە نافیع لە ئەبو سەلەمە لە ئەبو هورەیرەوە، هەروەها محەمەدی کوڕی عەجلان کەسێکی متمانەپێکراو و شکۆدارە، بەڵام ئەوەندە هەیە شپرزاندویەتی بەوەی باسی لە "نافیع" کردووە، عوقەلییش لە کتێبی "الضعفاء الكبير"دا (١١٨/٤) فەرمویەتی: عەبدوڵڵای کوڕی ئەحمەد بۆی گێڕامەوە، ئەویش ئەبوبەکری کوڕی خەلاب بۆی گێڕاوەتەوە، دەڵێت: لە یەحیا بیستم وتی: ئیبنو عەجلان ئەو فەرمودەیەی کە لە ئیبنو نافیعەوە ریوایەتی کردووە فەرموودەیەکی شپرزەیە (واتە جۆری ئەو فەرموودەیەی ئەو ریوایەتی کردووە فەرموودەی "مضطرب"ە)، لەلای ئەو ئەو فەرموودەیە ئەو نرخەی نەبوو.. کۆتایی، ئەم فەرموودەیە کە تیایدا شپرزەکە "محەمەدی کوڕی عەجلان"ە، ئەوەتا جارێك لە ئەبو سەعیدی خودریەوە ریوایەتی دەکات و جارێکی تر لە ئەبو هورەیرەوە ریوایەتی دەکات، هەروەها "البزار"یش لە فەرموودەی ئیبنو عومەرەوە ریوایەتی کردوە: کە پێغەمبەر ﷺ فەرمویەتی: (ئەگەر سێ کەس بوون با دوانتان یەك نەگرن و دانەیەکتان بە تاکی بمێنێتەوە، ئەگەر سیانتان لە سەفەردابوون با یەکێکتان ببێتە ئەمیر)، بەڵام لە گێڕانەوەکەی محەمەدی کوڕی عەجلان لە نافیعەوە ئەویش لە ئیبنو عومەرەوە، پێشتریش قسەی "العقيلی" لەسەر ریوایەتەکەی محەمەد کوڕی عەجلان لە نافیعەوە باسی لێوەکرا، هەروەها "البزار"یش لە مەسنەدەکەی خۆیدا (٣٩٢) ریوایەتی کردووە لە فەرموودەی عومەری کوڕی خەتاب –خوا لێی رازی بێت– فەرموویەتی: (ئەگەر ئێوە سێ کەستان لە سەفەردابوون با یەکێکتان ببێتە ئەمیرتان)، ئەوە ئەو ئەمیرەیە کە پێغەمبەر ﷺ فەرمانی پێ کردووە، "البزار" وەك بەدواداچوونێك بۆ فەرموودەکە دەڵێت: ئەم فەرموودەیە زیاد لە کەسێك ریوایەتی کردووە لە ئەعمەشەوە ئەویش لە زەیدی کوڕی وەهەبەوە ئەویش بە مەوقوف لە عومەرەوە

کۆمەڵێك– ، بەگوێرەی ئەو بەها و ئامانجانەی کەباوەڕیان پێیەتی و پێوەی پابەندن، بەهەمانشێوە هێنانەدی بەرژەوەندییەکانیان و راماڵینی ئەوکۆسپ و مەترسییانەی دەرەنجامی جێبەجێکردنی ئەو پەیوەستانامەیە کە لە نێوان ئەو گەلەی کە ئازادانە هەستان بەهەڵبژاردنی ئەو ئەندامەی کە ئەرکیانداوە بەسەریدا تا ببێتە نوێنەریان بۆ هەستان بەو ئەرکە، لەبەرئەوە بەکارهێنانیان بۆ وشەی "أمير المؤمنين" لای ئەوان مانای دەسەڵات و خۆسەپاندن هەڵناگرێت بەو شێوەیەی لە زیهنی ئەمەوی و عەباسی و عوسمانیەکاندا هەبوو، واتای ئەمیر لە سەرەتای ئیسلامدا، یاخود لە سەرەتای یەکەمدا، ئەو مرۆڤە بوو کە گەل بەرپرسیارێتیەکی گەورەی خسبووە ئەستۆی و بڕیاری هاوکاریکردنیان پێدەدا، هەر بۆیە دەبینین کاتێك یەکێك لەوانەی کە لە ژیاندا مابوو تا سەردەمی دەسەڵاتی مەعاویە، ئەو هەستەی مەعاویەی بۆ

---

ریوایەتیانکردووە، ناشزانین کێ فەرموودەکەی داوەتە پاڵی، تەنها قاسمی کوڕی مالیك لە ئەعمەشەوە نەبێت، ئەوەبوو پرسیار کرا لە "الدارقطني" دەربارەی فەرموودەکەی عومەر لە کتێبی "العلل"دا (١٥١/٢) ئەویش وتی: بریتییە لەو فەرموودەیەی کە لەلایەن قاسمی کوڕی مالیکی کوڕی موزەنی و حوسەینی کوڕی عەلوانەوە ریوایەتکراوە فەرموودەیەکی لاوازە، لە ئەعمەشەوە لە زەیدی کوڕی وەهبەوە لە عومەرەوە وتویەتی کە ئەوە راستە، کۆتایی. هەروەها ریوایەتکراوە لە عەلی کوڕی جەعدەوە لە مەسنەدەکەیدا (ل ٣٧٢، حاشیەی ٤٤٣) لەرێگەی "شعبە"وە لە ئەبو ئیسحاقەوە لە ئەبو ئەحوەصەوە لە عەبدوڵڵای کوڕی مەسعودەوە بە زارەکی لە عەبدوڵڵاوە دەڵێ: (ئەگەر ئێوە سیانتان لە سەفەردابوون با یەکێکتان ببێتە ئەمیرتان با دوانتان نەچنە پاڵ یەك بەبێ هاوڕێکەی ترتان). "الهیثمی" لە "المجمع" (٢٥٦/٥)دا دەڵێت: پیاوەکانی ئەو ریوایەتە پیاوی چاك و متمانە پێکراون، کۆتایی. فەرموودەش بە (مەرفوعی) لە پێغەمبەرەوە ریوایەت ناکرێت، جێگیریش ئەوەیە کە (مەوقوفە) لەلایەن عەبدوڵڵای کوڕی مەسعودەوە.

دەرکەوت کە خۆی لەسەرو خەڵکەوە دەبینێتەوە، بۆیە کاتێ کە سڵاوی لێ کرد پێ وت: سڵاو ئەی کرێکار،[1] هەروەها ئەبو زەڕی غەفاریش هەمان شێوە کاردانەوەی هەبوو، کاتێ کە مەعاویە بە (ئەی برام) وەسفی کرد، لە وەڵامدا غەفاری پێی وت: بەڵکو تۆ تەنها برای کۆشك و کاربەدەستانی، هەر لە دەسپێکی دەمدڕینەوەکەیدا خێرا دەست و پێوەندی مەعاویە ناڕەزاییان پیشاندا، بەڵام مەعاویە ناڕەزایی نیشان نەداو پشتگیری کرد، کە ئەو هەڵوێستەش سەلمێنەری ئەوەیە لای مەعاویەش نازناوی ئەمیر لە سەردەمی یەکەمدا وەك خۆی و بێلایەنانە بەکارهێنراوە، کە ئەویش هەڵنەگرتنی واتای ئیمارەت بە هەموو ئەو مانا جۆراوجۆرانەی کە دەسەڵاتداران دەیاندایە پاڵی لە بەرزی و بڵندی و دەسەڵات و توندوتیژی، هەردوو خەلیفەیش بنچینەی تێگەیشتنیان بۆ (خەلافەت لەسەر ڕێبازی پێغەمبەر) لەسەر هۆشیاری سیاسی گەل بنیاتنابوو، بۆیە خیلافەتی هەریەکێك لەوان وەك خیلافەتی پێغەمبەر داوود وابوو، ئەمەش بوویە مایەی ماندووکردنی ئەوانەی دوای ئەمان هاتن، بۆیە ئەو شۆڕشەی کرا بەسەر خەلیفە عوسماندا –خوا لێی رازی بێت– شۆڕشێك بوو پاڵپشتی لەو هۆشیاریەوە هەڵێنجابوو کە لەسەر دەستی ئەو دوو خەلیفەیەوە داڕێژرا بوو لەگەڵ بوونی زۆرێك لە لادان و خراپ حاڵیبوون لێی، ئەویش دەرهاویشتەی ئەو وڵاتانەبوو کە ئەو

[1] ئەم وتەیە دەدرێتە پاڵ ئەبو موسای خەولانی. بڕوانە: أبو نعيم الأصبفهاني، أحمد بن عبد الله. "فضيلة العادلين عن الولاة" تحقيق: مشهوور حسن محمود، رياض: دار الوطن، ١٩٩٧م، ص: ١٦٦.

خەڵكانەی لێوە هاتبوون و گەمارۆی ماڵەكەی خەلیفە عوسمانیان دابوو، كە بە كوشتنی نەبێت بە هیچی تر قایل نەدەبوون، لەگەڵ ئەوەشدا ئینكاری ئەوە ناكرێت كە هەندێك لەو رەخنانەی كە ڕووبەڕووی گەورەمان خەلیفە عوسمان دەكرایەوە هەندێك راستی و حەقیقەتیان لەخۆ گرتبوو، ئەمەش ئاماژەیەكی ترسناكە لەسەر چۆنیەتی تێكەڵاوبوونی ئەو بۆچوونە دروست و زیندووانە لەگەڵ ئەو بۆچوونە مردوو و خنكێنەرانەدا.

هەر بۆیە هەمیشە دیدو بۆچوون، پێویستی بە تێبینی و وردكردنەوە هەیە بۆ زانینی ئاڕاستەكەی، پێش ئەوەی لار ببێتەوە بەرەو لادان و ترازان لە مانا دروستەكەی و راستكردنەوەی یەكبەیەكی ئەو ئاڕاستانە، چونكە بیروبۆچوونەكان وەك دەرمان وایە، دروست دەكرێت، بەڵام هاوكات كاریگەرییە لاوەكیەكانیشی لەگەڵدا دروست دەبێت، خۆ ئەگەر بەوردی چاودێری نەكرێت، ئەوا بێگومان بەرەو لادان دەڕوات، یاخود كەسانی لار بەرەو لادان دەیبەن .

## دووەم : دەروازەیەك بەرەو تێگەیشتن لە چەمكی حوكمڕانی لەلای گەلانی رابردوو

سەرەتا دەمەوێت هۆشیاری بدەم لەسەر هەندێك لەو رێنماییانەی كە تێبینیكردن و وەستان لەسەریان بەكارێكی گرنگ دەژمێردرێن بۆ هەرسكردنی ئەم چەمكە ترسناكە، ئەگەر بەو شێوەیەش نەبوو، ئەوە دەبێتە یارمەتیدەر بۆ گەیشتن بەجۆرێك لە وردەكاری و دیاریكردن بۆ نزیكبوونەوە لێی .

أ- بەگونجاوی دەبینم ئەگەر ئاماژەیەك بكەین بە دوعاكەی باوكی پێغەمبەران ئیبراهیم –سەلامی خوای لەسەر–، خوای باڵادەست بەم شێوەیە دواندی: ﴿إِنِّي جَاعِلُكَ لِلنَّاسِ إِمَامًا قَالَ وَمِن ذُرِّيَّتِي قَالَ لاَ يَنَالُ عَهْدِي الظَّالِمِينَ﴾ (البقرة: ١٢٤) واتە: {بڕیارم داوە كە بتكەمە پێشەوای خەڵكی لە هەموو سەردەمەكاندا، ئەویش وتی: پەروەردگارا من حەز دەكەم كە نەوەكانیشم لەو بەهرەیە بێبەش نەبن، خوای گەورە فەرمووی: پەیام و پەیمانی من بۆ ستەمكاران نابێت}، لێرەدا مۆڵەتێك هەیە بۆ ئیمامەت لەلایەن كەسێكەوە ئەویش خوای باڵادەستە، هەروەها ستەم و داد هەیە وەك بەهایەك پێویستە بناسرێن، كەسانێك هەن لەناو مرۆڤەكاندا ستەم لە خۆیان دەكەن، كەسانێكیش مام ناوەند و میانڕەون، هەیشە دەستپێشخەرن لە چاكەدا، ئیمامەتیش لەم ئایەتە پیرۆزەدا شێوەیەكە لە بەڵێنی خوایی لە نێوان خوای بەرز و باڵا و مرۆڤدا، بەڵێنێكە ستەمكاران ناگرێتەوە و لێیشی نزیك نابنەوە، كەسیش بۆی نییە بەهیچ كلۆجێك لێی نزیك ببێتەوە، چجای ببنە خاوەنی، ئا لێرەوە بەهای داد بەرامبەر ستەم دەردەكەوێت بەو سیفەتەی كە –پاش یەكتاپەرستی– لای پێغەمبەران ئامانجی یەكەمە، هەروەها لای ئەو كەسانەی كە لە دوای پێغەمبەرانەوە هەڵدەستن بە كاری چاكسازیی، بۆیە كۆمەڵێك زاراوە و چەمكی لاوەكی بەدەردەكەون: پێشەوایەتیەكی راوەستاو بە دانانێكی خوایی، بەڵێنی خوایی، ستەم و ستەمكاران بەرامبەر داد و دادپەروەران و زۆرێكی تریش،.. ئەم بانگەوازە لەلایەنی خوای باڵادەستەوە بۆ ئیبراهیمی باوكی پێغەمبەرانە و بەردەوامیش دەبێت بۆ هەموو ئەوانەی خوای گەورە

کردوونـی بـه پێشـەوا و پێشـەنگ لـه پێغەمبـەران و نێردراوانـی خـوایی، ئەوانەی کە خوای گـەورە فـەرمانمان پـیٚ دەکـات بـەباوەڕبوون پێیـان و شوێنکەوتنیان ﴿وَجَعَلْنَا مِنْهُمْ أَئِمَّةً يَهْدُونَ بِأَمْرِنَا لَمَّا صَبَرُوا وَكَانُوا بِآيَاتِنَا يُوقِنُونَ﴾ (السجدة: ٢٤) واتە: {هەروەها کردمانن بە چاوساغ و پێشـەوای گـەلان لـە سـەردەمەکانی پێشـوودا، کاتێـك کـە زۆربـەیان خـۆگری و ئارامگرییـان کـردە کـاڵای بـاڵای خۆیـان و بـە تـەواوی دڵنیـابوون لـە ئایەتـەکانی ئێمـە لـە تەوراتـدا و دواتـریش لـە سـەردەمەکانی داهـاتوودا هەنـدێکیان مسـوڵمان دەبـن و بـاوەڕ دەهێـنن بـە ئایەتـەکانی ئێمـە لـەم قورئانەدا}، ﴿وَاجْعَلْنَا لِلْمُتَّقِينَ إِمَامًا﴾ (الفرقان: ٧٤) **واتە:** {پەروەدگارا.. بمانکە بە پێشەوای تەقواداران و پارێزکـاران}، ﴿أُوْلَئِكَ الَّذِينَ هَدَى اللّهُ فَبِهُدَاهُمُ اقْتَدِهْ قُل لاَّ أَسْأَلُكُمْ عَلَيْهِ أَجْرًا إِنْ هُوَ إِلاَّ ذِكْرَى لِلْعَالَمِينَ﴾ (الأنعام: ٩٠) واتە: {ئـەو پێغەمبەرانـەی کـە باسـکران، ئـەو کەسـانەن کـە خـوای گەورە بەتایبەتی هیدایەت و ڕێنمـوونیکردوون، تـۆش شـوێنی هیدایـەت و ڕێنمونی ئەوانە بکەوە، هەروەها بەو خەڵکە بڵیٚ کە من هیچ پارە و پوول و سامانێکم لە ئێوە ناوێت، دڵنیاش بن کە ئەم قورئـان و بەرنامەیـەی بـە مندا ڕەوانەکراوە تەنها یادخەرەوەیە بۆ هەموو خـەڵکی ئـەم جیهانـە، تـا پەیڕەوی بکەن و پیادەی بکەن}.

ب– وادیارە لە بابەتی ئیمامەت و پەیوەستکردنی بەوەی کە دانانێکی خواییـە لـە بۆچـوون دەربـارەی کەسـانی پاڵفتـەکراو لەلایـەن خـواوە سەرچاوەی گرتووە، ئەم بۆچوونەش پێویستە ڕەچاو بکرێت لەگەڵ ئـەو کرداری دانان و هەڵبژاردن و پاڵفتەکردنی تاکەکانـدا: ﴿اللَّـهُ يَصْـطَفِي مِنَ

الْمَلَائِكَةِ رُسُلًا وَمِنَ النَّاسِ إِنَّ اللَّهَ سَمِيعٌ بَصِيرٌ﴾ (الحج: ٧٥) واتـه: {ئـەو خواى كە ڕێزى بۆ دروستكراوە شايستەكانى داناوە، لـە فريشتـە و لـە خەڵكى، كەسانێكيان لێ هەڵدەبژێرێت بۆ ڕێنوێنى ئەوانى تر ... بەڕاستى ئەو خوايە تەواو بيسەرە بە گفتوگۆى بەندەكانى، تەواويش بينايە بە كار و كردەوە و هەڵسوكەوتيان} ئەو هەڵبژێردراوانـەش پەيوەستن بـە چـەند سيفەتێكى دياريكراو تا لێيانەوە كردارى پاڵفتـەكردنى خـوايى بـۆ گـەل و نەتەوەكان تێبگەين: ﴿إِنَّ اللّهَ اصْطَفَى آدَمَ وَنُوحًا وَآلَ إِبْرَاهِيمَ وَآلَ عِمْرَانَ عَلَى الْعَالَمِينَ﴾ (آل عمران: ٣٣) **واتە:** {لەڕاستيدا لە نێو گرۆى ئيمانداراندا خـواى گـەورە ئـادەم بـاوكى سـەرجەم مرۆڤـەكان و نـووح پێغەمبـەر و ئيبراهيم و نەوەكانى (كـە محمـد ﷺ لـە نـەوەى ئيسـماعيلى كوڕيـەتى)، هەروەها خانەوادەى عيمرانى هەڵبژاردووە، (بەهۆى دينداری و خواناسى و پابەند بونيانەوە بـە فەرمانـەكانى خـواوە)، وە بـاوى داون و ڕێـزى داون بەسەر سەرجەم خەڵكانى تردا}، كردارى پاڵفتەكارى خوايى بـۆ تاكـەكان كە ئەوانيش پێكدێن لە پێغەمبەران و نێردراوان و هەڵبژاردنى گـەلانێك تـا ببنــە زەمينــەى چــالاكى ئــەو پێغەمبــەر و نێردراوانــە و زەمينــەى سەركردايەتيكردن و هيدايەتدان، ئەمەش كارێكە دەبێت لەبەرچاو بگيرێت كاتێك ئێمە دەمانەوێت گفتوگۆ بكەين لەسەر چەمكى (حوكمڕانى خوايى)، كە ئەوەش پاڵفتەكردنێكە بۆ لە ئەستۆگرتنى ئەركێكى دياريكراو، ئەويش ئەركى جێنشينيكردنە .

ت- ناچارين كەمێك بگەڕێينەوە دواوە بەمەبەستى چاوخشاندنەوە بە مێژووى سيستمى ياسايى و تەشريعى و كۆمەڵايـەتى، كـە مرۆڤايـەتى لـە

سەردەمە جۆراوجۆرەکاندا بەخۆوەی بینیوە، تا ئەو سیستمانەمان بۆ ئاشکرا بێت کە بەشێوەیەك لەشێوەکان لەسەر بنەمای (حوکمڕانی خوایی) یاخود (دەسەلاتی خوایی) دامەزراون، ئەو ڕژێمانەش زیاتر لای سۆمەری و ئەکەدیەکان ناسراو بوون، هەندێکیشیان لای بابلیەکان ناسراو بوون، هەروەها لای فیرعەونییەکان و جگە ئەمانیش لای نەوەکانی شارستانیەتە کۆنەکان، بەهەمانشێوە دەبینین چەندین رژێم هەبوون بەناوی خەلکەوە حوکمیان کردووە، ئیتر خەلکی شارێك، یان خەلکی هۆزێك، یان هەر خەلکێکی تر بووبێت، ئەگەر سەیرێکی ئەو مێژووە بکەین لەپێشیەوە کاروانێك دەبینین و تێبینی دەکەین، کە ئەوەش زۆر یارمەتیدەر دەبێت بۆ بوونی هۆشیاری بە سروشتی چەمکی دەسەلاتدارێتی بەشێوەیەکی ڕەها، سەرەنجام زۆرێك لە رێباز و یاسا کۆنەکان بەشێوەیەك لە شێوەکان دەدرانەوە پال (ئایین)، بۆیە هەندێك لە سیستمی شارستانیەتە کۆنەکان لەلایەن پیاوانی پەرستگاکانەوە "کاهینەکان" دەردەچوون، هەندێکی تریشیان لەلایەن پاشا و سەرکردەکانەوە دەردەچوون، ئەوانەیان لەلایەن کاهینەکانەوە دەردەچوون بە سروشی خوایی دادەنران، یاخود بە (سێبەری خوایی لەسەرزەوی) دەژمێردران، کە ئەم جۆرەش لە ڕێسا و یاسا و فەرمانەکان، دەسەلات، یاخود هێزی خوایی پێدەبەخشرا لەو بوارەدا، لەبەرامبەر ئەمەشدا هەندێك لە گەلانی کۆن بەوە دەناسرانەوە بەتایبەت گەلی رۆما کە بۆچوونیان وابوو ئەو شەریعەتە یان ئەو بنەما تەشریعیانە کارێکی مرۆییە و لەلایەن مرۆڤەکانەوە دەردەچێت، نەك لەلایەن خواوەندەوە، بەو

پێیە ئەم گەلە گوزارشتیان کرد لە ویستی خۆیان بۆ جیاکردنەوەی ئایین و یاساکان لە یەکتری لە رۆمادا، جیاکردنەوەیەك کە تا ئێستاش زۆرێك لە زانایانی بواری یاسا بە گرنگترین تایبەتمەندی هەژماری دەکەن، بەوپێیەی یاساکانی رۆمانی جیا ئەکاتەوە لە زۆربەی سیستمە یاساییە کۆنەکانی تر.

لەڕاستیدا هەندێك لە مێژوونووسانی سیستمی یاسایی و کۆمەلایەتی ئەوە رەتدەکەنەوە کە رۆلی یەکەم بگێڕدرێتەوە بۆ ئایین لەوە خاوەنداریتی سیستمی گشتی کردبێت لە شارستانیەتی ولاتی کۆنی نێوان هەردوو رووبار (عێراق)، لە بنەڕەتدا شارە سۆمەریەکان دەسەلاتێکی ئایینی حوکمی ئەکردن، هاوکات لەپال دەسەلاتدارێکی مەدەنی کە بەجێنشینی خواوەند لە زەویدا دەژمێردرا، کە ئەویش گەورەترین کاهینەکانی مەملەکەت بوو، ئەمەش بە واتای بوونی جۆرە یەکخستنێك لەنێوان هەردوو دەسەلاتدا: دەسەلاتی کاتیی و دەسەلاتی ئایینیی، حوکمەکانیش لەو شارستانیەتە کۆنەدا بەناوی خواوەندەوە جێبەجێ دەکران، بەلکو دیاریکردنی پاشا – لەو شارستانیەتەدا – دەدرایەوە پال خواوەند، بەجۆرێك لەجۆرەکان خواوەند خۆی پاشای هەلدەبژارد.

بەلام لە سەردەمی پاشایەتی ئەکەدیەکاندا چەمکی حکومەتی جیهانی سەریهەلدا و پاشای گەورە بە پاشای هەرچوار لای جیهان وەسفدەکرا، پاشاش خۆی بە یەکێك لە خواوەندەکان دەژمارد و خۆی بە بەرپرس لە

جێبەجێکردنی ویستی کۆمەڵەی خواوەندەکانی زەوی دەزانی، هەربۆیە ئەو گوزارشت لە خواستی خواوەند دەکات و بە سرووشی ئەو نەبێت کار ناکات، هەر ئەویش بەرپرسە لە لادان و هەڵەکانی رەعیەتەکەی لەبەردەم خواوەندا، دەرەنجامی ئەوەش پێویست دەکرا لەسەر رەعیەتەکانی خواوەند تا ملکەچییەکی تەواو دەربڕن.

بەڵام لە دەوڵەتی حەیسیەکاندا لە وڵاتی نێوان هەردوو رووبار، کەمێك حاڵەتەکە گۆڕا و جیاوازبوو لەوەی لە دەسەڵاتدارێتیە گەورەکاندا هەبوو، ئەوانەی یاسای خواییان لە میسر یان لە بابل هەبوو، وای لێهات پاڵپشتی دەسەڵات تەنها بریتی بوو لە هێز، شەرعیەتی بوونی پاشا و گوێڕایەڵیکردنی لەسەر بەهێزی و زاڵبوون و توانای بەدەستهێنانی سەرکەوتنی بەسەر ئەوانی تردا وەستابوو. ئەوەشی پەیوەندی بە لایەنی ئایینیەوە هەبوو لەم دەوڵەتەدا، پاشا نە بە خواوەند و نە بە جێگرەوەی خواوەند نەدەژمێردرا، بەڵکو بەوە دەژمێردرا کە لەبەر ئەوەی توانای هەیە بۆ سەرکەوتن، کەواتە یارمەتی خواوەندی لەگەڵە و پاش مردنیشی دەچێتە ریزی خواوەندەکانەوە و وەك یەکێك لەوان هەڵسوکەوتی لەگەڵ دەکرێت، یاخود وایان دادەنا رایەڵەیەکی پەیوەندی بێت لە نێوان خودا و خەڵکدا، هەروەك لای بابلیەکانیش بەو شێوەیە بوو، هەرچی خەوبینین و نووستن و گەشبینی و رەشبینیەکانیشی هەیە بە هۆکارێك لە هۆکارەکانی پەیوەستبوون بە خواوەندەوە لێکیاندەدایەوە.

بێگومان گرنگترین گەلێك كە پێویستە بیر لە كلتوورەكەی بكرێتەوە – لە بواری دەسەڵاتدارێتی خواییدا – عیبرانیەكانن، پاشان نەوەكانی ئیسرائیل "جوولەكە" زاراوەی عیبرانی گشتگیرتر و بەربڵاوترە لە زاراوەی نەوەكانی ئیسرائیل، لە دروستترین وتەكانی مێژوونووسان: جوولەكەكان ئەوانەن لە رووبـاری فووراتەوە پەڕیونەتەوە بەرەو فەڵەستین و شوێنەكانی تر، پاشان هەندێكیان لە فەڵەستین نیشتەجێبوون و تێكەڵ بەسامیەكان بوون و شوێن بیروباوەڕی ئەوان كەوتوون، هەندێكیشیان چوونەتە میسر و لەوێ ماونەتەوە، كەواتە عیبرانیەكان، یاخود عیبریەكان، هەیانە میسرین و سامیەكانیشیان تێدایە كە لە عێراقەوە هاتوون، وڵاتی نێوان دوو رووبارەكەیان بەجێهێشتووە و چوونەتە فەلەستین و بە پلەی یەكەمیش چوونەتە میسر و هەندێك ناوچەی دەوروبەر.

عیبرانیەكان ماوەیەكی دورودرێژیان بەجێگۆڕكێكردن بەسەربردووە، زیاتر لە حاڵەتی دەشتەكیەكان دەچوون، كە لەملا بۆ ئەولا دەگەڕان تا لەوەڕگایەكیان بەدەست بكەوێت، خۆ ئەگەر هەر كات شوێن و هۆكارێكی لەبار و گونجاو و ئاودایان دەستبكەوتایە حەزیان بەجێگیربوون دەكرد، ئەوان لەو قۆناغەدا هۆزبوون، هۆزیش پێكدەهات لە چەند خێزانێك كە خۆیان لە بنچینەدا بەیەك دەزانی.

پەیوەندی بنەڕەتی لەنێو ئەم جۆرە سیستمە هۆزایەتیەدا، پەیوەندی خوێنە، كە دەكرێت لە سەرەتادا –كاتێك كە هۆزەكە بچووكە– حەقیقی

بێت، بەڵام کاتێك هۆزەکان جۆری تریان تێکەڵ دەبێت، پێویست دەکات هۆزەکە ئەوانیش بخاتە چوارچێوەی دەسەڵاتداریێتی خۆیەوە، ئەویش پێی قایل دەبێت، بۆیە شتێکی فراوانتر لە پەیوەندی خوێن لەنێوان ئەوانەی کە ئەو هۆزە تێکەڵاوە پێکدەهێنن پەیدا دەبێت، خاوەن دەسەڵات لە حوکمی هۆزایەتیدا، لە نەریتی عەرەب و جگە عەرەبیش ئەوانەی کە ژیانی دەشتەکی دەژیان شێخی هۆزەکەیە، هەرخۆی حاکمیانە و هەرئەو خاوەن دەسەڵاتی گوێ بۆگیراوە و شتەکان بە ویستی ئەو و رەزامەندی ئەو دەبێت، عیبرانیەکانیش شێخی هۆزیان هەبوو، بەڵام ئەوەی جێگای تێڕامانە زۆرێك لەو شێخانە نازناوی "نصی"یان بۆ دادەنرا، دەیانوت "نصی"، یان فلان "نص"ـە، مەبەستیان پێی شێخ یان گەورەی هۆزەکە بوو، ئەویش لەسەر بناغەی ئەوەی کە ئەویان بە چاکترین و شەریفترین کەسی هۆزەکە "نواصی القوم" هەڵبژاردووە، هەربۆیە پێی دەوترا "نصی" بەوپێیەی هەڵبژێردراوەکە گەورەترین و بەڕێزترین کەسیانە[1].

هۆزە عیبریەکان لە وڵاتی کەنعان (فەڵەستین) مانەوە و تێکەڵ بە سامیەکانی خەڵکی باشوور بوون و چوونە سەر بیروباوەڕی ئەوان، پاشان ئیسرائیل و کوڕەکانی کۆچیانکرد بۆ میسر، پێش ئەوانیش یوسف – سەلامی خوای لەسەر– لە دەرەنجامی فێڵ و تەڵەکەی براکانی کەوتبوویە ئەوێ، دواتر لەوێدا بووبوویە وەزیری فیرعەون، مێژوونووسان بۆچوونیان

[1] بڕوانە: بدر، محمد. "تأريخ النظم الاجتماعية والقانونية".

جیاوازە لەسەر دیاریکردنی مێژووی ئەو کۆچکردنە، هەرچەند هەندێکیان پێیانوایە دەکەوێتە سەدەی هەژدەهەمی پێش زایین، یەکەمجار نەوەکانی ئیسرائیل لە رۆژهەلاتی دەلتا لە میسر وەك ئاژەلدار نیشتەجێ بوون، پاشان وەك جوتیارێك بۆ ماوەی چەند سەدەیەك تێیدا جێگیربوون، ئەگەر سەیری ئەم سەرچاوەیە بکەین کە لەسەر جۆرێك لە گریمانە وەستاوە و هەولبدەین شتێك بدۆزینەوە پشتی پێ ببەسترێت، دەستمان دەکەوێت لە سەر دەقەکانی سەردەمی کۆن کە تێیدا ماوەی نێوان گەیشتنی ئیبراهیم و کۆچی ئیسرائیل و نەوەکانی بەنزیکەی دوو سەدە دیاری کردووە، ئەم وتەیەی لێوە هاتووە: ئیبراهیم کاتێك کە (حەران)ی بەجێهێشت بەرەو فەلەستین تەمەنی حەفتاو پێنج سال بوو، پاش تێپەربوونی بیست و پێنج سال ئیسحاقیش لەدایك بوو[1]، (کە ئیسحاق تەمەنی گەیشتە شەست سال یەعقوبیان لەدایکبوو) سیفری تەکوین/٢٥/٢٦، (کاتێکیش یەعقوب گەیشتە میسر تەمەنی سەدو سی سال بوو) سیفری تەکوین/ ٤٧/٩، کاتێك ویستی خوای بالادەست لەسەر ئەوە بوو نەوەکانی ئیسرائیل پالفتە بکات و رزگاریان بکات لە حالەتی پەرشوبلاوی و هۆزایەتی تا ببنە یەك نەتەوە و بتوانن تەورات هەلبگرن، رێگایان پێدرا لە میسر بچنە دەرەوە، مووسایشی بۆ هەلبژاردن - سلاوی خوای لەسەر - تا بەو ئەرکە هەستێت و ئەو پەیامە جێبەجێ بکات و

---

[1] کتێبی پیرۆز، قاهرة: دار الكتاب المقدس، حەوتەم دەرکردن، ط٢، ٢٠٠٨ز، سیفری تەکوین (١٢/٤)

هۆزەکـانی نـەوەی ئیسـرائیل یـەك بخـات و بیانکاتـە یـەك گـەل و نەتەوەیەکیان لـێ پێکبهێنێـت، تـا پەیوەندییـەکی بیروبـاوەڕی و ئـایینی لەنێویاندا دروست ببێت .

بـۆ یەکخسـتی هـۆز و باڵـەکانی ئیسـرائیل و کردنیـان بـە یـەك گـەل، پێویستی بە ماندووبوونێکی زۆر هەبوو، کە مووسا و هـاروونی بـرای پێـی هەستان هـەر لـەکاتی چـوونەدەرەوەی نـەوەکانی ئیسـرائیل لـە میسـر و پەڕینـەوەیان لـە دەریـا، دیـارترینی ئـەو هۆکـارەش کـە گیرایەبـەر بـۆ یەکخستی هۆزەکان و گۆڕینیان بۆ یەك گەل، ئەو کۆبوونەوەیەیان بوو لـە دەوری مووسـا بەوپێیـەی نێـردراو و پێغەمبـەری خوایـە بـۆ نـەوەکانی ئیسرائیل، ئەم یەکخستنەوەیەیان وای کـرد کـە هـەموویان پێکـەوە بـن و قـایلبن بـەو پەیامـەی کـە ئـەوان بەشـێکن لـە گـەلی خـوا و سـەرزەمینی پیرۆزیش کە خوای گەورە پیرۆزی کـردووە و ئـەوانی بـەرەو ئـەو شـوێنە ناردووە زەوی و مەملەکـەتی خوایـە، ئـەوەی دەیـەوێت لـە بازنـەی گـەلی خوادا بێت و پـەیوەست بێت بە مەملکەتی خـوا لـە نـەوەکانی ئیسـرائیل، لەسەریەتی راستەوخۆ قبووڵی (دەسەڵاتدارێتی خـوا) بکـات و بۆچـوون و بـاوەڕی وابێـت کـە مووسـا و هـاروونی بـرای هـەردووکیان نێـردراو و پێغەمبەرن لەلایەن خواوە، وتە و پەیامەکانی خوایان هەڵگرتووە بـۆ ئـەو گەلە، هـەروەها دەبێـت رەزامەنـدبن بەدەرچـوون بـەرەو خـاکی پـیرۆز و مانـەوە و پەیوەسـتبوون پێـوەی، دەبێـت رازی بـن بـەوەی لـە تەوراتـدا هاتووە و لەوەی کە مووسا هێناویەتی لە (لوح) تـابلۆی پـارێزراو لەلایـەن خواوە.

لەڕاستیدا ئەمەش پەیوەست بوو بەوەی کە خوای بێهاوتا وەڵامی هەموو ئەو داوایانەی ئەو گەلەی دایەوە لەو بەخشیشە خواییەی کە داوایان کردبوو، کاتێ کە داوای ئاویان کرد کانیاوی بۆ تەقاندنەوە، کاتێکیش داوای خواردنێکی تایبەتیان کرد بۆی ئامادەکردن و گەزۆو شەونمی بۆ باراندن ﴿فَقُلْنَا اضْرِب بِّعَصَاكَ الْحَجَرَ فَانفَجَرَتْ مِنْهُ اثْنَتَا عَشْرَةَ عَيْناً﴾ (البقرة: ٦٠) واتە: {ئێمەش نیگامان بۆ کرد کە دار عەساکەت بماڵە بە بەردەکەدا، هەر کە ئەو کارەی کرد لە دوانزە شوێنی بەردەکەوە ئاوی سازگار هەڵقوڵاو و دوانزە کانی دروست بوو}، ئەو بەخشیشە خوایی و موعجیزە ئامێزە و ئەو دەسەڵاتە هەستیارە لەڕادەبەدەرەی کە بەخشیبووی بە پێغەمبەر مووسا، مەرجدار و هاوتای کرد بە ئامادەکردنی سزایەکی توند، جەختیشی کردەوە لەوەی پێویستە ئاگاداری ئەو دەرەنجامەبن کاتێ بیانەوێت گوێڕایەڵی خوای باڵادەست نەکەن، ﴿وَإِذ نَتَقْنَا الْجَبَلَ فَوْقَهُمْ كَأَنَّهُ ظُلَّةٌ وَظَنُّواْ أَنَّهُ وَاقِعٌ بِهِمْ خُذُواْ مَا آتَيْنَاكُم بِقُوَّةٍ وَاذْكُرُواْ مَا فِيهِ لَعَلَّكُمْ تَتَّقُونَ﴾ (الاعراف: ١٧١) واتە: { بیریان بخەرەوە کاتێك کە کێوی طورمان لە جێی خۆی هەڵکەند و بەرزمان کردەوە بە ڕاسەریانەوە وەکو پەڵە هەورێکی چڕ، ئەوسا بە تەواوی ترسیان لێ نیشت و وایانزانی کە دەکەوێت بە سەریاندا، ئینجا پێمان وتن: ئەو تەورات و بەرنامەیەی بۆمان ڕەوانە کردوون بە توندی بیگرن و پەیڕەوی بکەن، ئەو فەرمانانەی تێیدایەتی با هەمیشە لە یادتان بێت و سنووربەزێنی مەکەن، هەوڵبدەن هەمیشە بە تەقوا و دیندار و پارێزکار بن}، خۆ ئەگەر سەرپێچی بکەن لەوەی پێیاندراوە، لەوێنەی ئەو موعجیزە و ئەو

بەخشیشــە خواییانــە تــا راســتەوخۆ بگونجێــت لەگــەڵ ســزا توونــدە ئامادەکراوەکـەدا، ئـەوەش ئاماژەیـە بـەوەی ئـەم گەلـە ئـەوەی داوایـان کردبـوو لـە خـوای باڵادەسـت، هـەمووی بـۆ هێناونەتـە دی، ئـەوەی کـە پێویســت بــوو پیشــانیان بــدات لــە شــتی لەڕادەبــەدەر و مــوعجیزە، پیشـانیدان، کەواتـە هـیچ بیانوویـەك نـەماوە تـەنها دەبێـت ملکـەچ بـن و تەسلیم ببن بە گوێڕایەڵیکردنی تەواو بۆ خواوەنـدی بـەرز و بڵنـد، لەگـەڵ ئەوەشدا نەوەکانی ئیسرائیل زۆر بەلەسە دەبوون و زۆر دەردەچـوون لـە ژێر ئەو دەسەڵاتە راستەوخۆیەی خـوای باڵادەسـت، ئەوەنـدە بەسـە کـە ئاماژە بکەین بە رووداوی هەڵگەڕانەوەی بەکۆمەڵ، ئەوەبوو هەرکە مووسا پشتی هەڵکرد و رۆیشت، خێرا هەڵگەڕانەوە و دەستیان کرد بە گوێرەکـە پەرستن، لەگـەڵ ئـەوەی هـاروونی برایشـی لەنێویانـدا بـوو، کـە ئەمـەش هەڵگەڕانەوەیەکی بەکۆمەڵ بوو لەلایەن ئەو گەلەی کـە هەڵبـژێردرابوو بـۆ یەکتاپەرسـتی خـوا و پەرسـتن و گوێڕایـەڵیکردن بـۆ حـوکمڕانی خـوایی، بـەڵکو زۆرجـار دەچـوون بەگـژ پێغەمبـەر مووسـادا و گلـەیی ئـەوەیان لێ دەکــرد کــە ئــەو دەریهێنــاون لــە خــاکی میســر و بووەتــە هۆکــاری بێبەشبوونیان لە خواردەمەنیەکانی میسر، لەڕاسـتیدا لـە کتـێبی پـیرۆزدا چەندین رستە هاتووە ئاماژە بـۆ ئـەوە دەکـەن[1]، لـە ئیصـحاحی سـی و دوودا هاتووە هاروون دەڵێ بە مووسای برای (سەلامی خوایان لەسەر): تۆ خۆت دەزانیت ئەم گەلە لەنێو خراپەدان.

[1] بڕوانە ئیصحاحی: (٩/٣٢ ، ٣،٥/٣٣).

لەڕاستیدا نەوەکانی ئیسرائیل شتی زۆریان بەسەر هات، کە بریتی بوون لە کۆمەڵێك گۆڕانکاری بەدوای یەك، بەتایبەت پاش وەفاتی هەردوو پێغەمبەر مووسا و هاروون (سەلامی خوایان لەسەر)، ئەوەبوو سەرلەنوێ ناکۆکی کەوتە نێوانیان، پەیڕەویکردنیان لێ تێکچوو، ئەو هاوبەندیە خزمایەتیەی کە لەنێوانیاندا هەبوو هەڵوەشایەوە، هەندێکیشیان تێکەڵ بە گەلانی دەوروبەریان بوون، هەندێکی تریشیان گەلانی دراوسێ کاریگەری لەسەریان هەبوو تا ئەو رادەیەی بوونەتە بتپەرست، هەروەك لە کتێبەکانی سەردەمی کۆن (حوکمڕانی قازیەکان) باسی لێوەکراوە، لەو قۆناغەشدا فیتنە و توندوتیژی کەوتە نێوانیان، هەرکاتێك پێغەمبەرێك هەستایە بە سەرلەنوێ بانگکردنیان بۆ یەکێتی و پێکەوەبوون، ئەوەی کە لەتوانایاندا بوو بەسەریان بهێنن بەسەریان دەهێنان، ئەوەبوو زۆرێك لە پێغەمبەرانیان کوشت، لە دەسەڵاتدارەکانیان هەڵگەڕانەوە، ئەو حاڵەتە خراپەیان بۆ خۆیان پێ پەسەند بوو لەکاتێکدا خوای گەورە لێی دەربازکردن و رزگاری کردن لێی، پاش ئەمەش بە کۆمەڵێك سەردەمی تردا تێپەڕین، یەکێك لەو سەردەمانە کە بە سەردەمی (حوکمڕانی قازیەکان) ناسرابوو، دواتریش بەو سەردەمەی کە بە سەردەمی (حوکمڕانی پاشایەتی) ناسرابوو.

خوای گەورە لە یەکێك لەو قۆناغانەدا پێغەمبەر (داوود و سولەیمان)ی بۆ ناردن (سەلامی خوایان لەسەر) بە سیفەتی دوو جێنشین: ﴿ يَا دَاوُودُ إِنَّا جَعَلْنَاكَ خَلِيفَةً فِي الْأَرْضِ فَاحْكُم بَيْنَ النَّاسِ بِالْحَقِّ وَلَا تَتَّبِعِ الْهَوَى فَيُضِلَّكَ عَن سَبِيلِ اللَّهِ إِنَّ الَّذِينَ يَضِلُّونَ عَن سَبِيلِ اللَّهِ لَهُمْ عَذَابٌ شَدِيدٌ بِمَا

نَسُوا يَوْمَ الْحِسَابِ﴾ (ص: ٢٦) واتە: {ئەی داود: ئێمە تۆمان کـردووە بـە جێنشین لەو وڵاتەدا ، هەمیشە هەوڵبـدە فـەرمانڕەوایی لـە نێـو خەڵکیـدا لەسـەر بنچـینەی حـەق و ڕاسـتی و دادپـەروەری ئـەنجام بـدە ، هـەرگیز نەکەیت شوێنی ئارەزوو بکەویت، بۆئەوەی نەبیتە هۆی وێڵکردنی خەڵکی لە ڕێبازی ئاینی خوای گەورە، چونکە ئەوانەی لـە ڕێبـازی خـوای گـەورە لادەدەن، سزای پڕ ئێش و ئازار بۆیان ئامادەیە، بەهۆی فەرامۆشـکردن و حسـاب نـەکردنیان بـۆ ڕۆژی قیامـەت}، بۆیـە قۆناغەکـە لـە قۆنـاغی (حـوکمڕانی خواوەنـد)ەوە راسـتەوخۆ گـۆڕا بـۆ حـوکمڕانی جێنشـینی پێغەمبـەران و نێردراوانـی خـودا کـە حـوکمڕانی ئـەو گەلـەیان بـەپێی شەریعەتی خوای باڵادەست دەکرد، هەروەها حوکمیان بەوە دەکرد کە لە تەوراتدا هاتووە، بەو پێیەی ئەوان پێغەمبەری جێنشینن لەلایەن خواوە، لەگەڵ ئەوەشـدا هەڵسوکەوتە ناپەسـەند و لادان و هەڵگەڕانـەوەیان هـەر بەوەیشەوە نەوەستان، بەڵکو داوایان کرد لە خـوا کـە وەك خـەڵکانی تـر پاشـایەکیان بـۆ دیـاری بکـات، ئەمـەش دەرەنجـامی چـاولێکەری لــە دەوروبەریان و بوونی ئارەزوو بۆ تێکەڵاوبوونیان بە گەلانی تر، بەتایبـەت حەزیان بەتێکەڵاوی ئەو هۆزە بتپەرستانە دەکرد کە لە دەوروبەریان بوون — لە هەندێك کات و قۆناغدا— خوای گـەورە لـە قورئـانی پـیرۆزدا ئامـاژە دەکات بۆ ئەم بابەتە: ﴿إِذْ قَالُواْ لِنَبِيٍّ لَّهُمُ ابْعَثْ لَنَا مَلِكًا نُّقَاتِـلْ فِـي سَـبِيلِ اللّهِ قَالَ هَلْ عَسَيْتُمْ إِن كُتِبَ عَلَيْكُمُ الْقِتَالُ أَلاَّ تُقَاتِلُواْ﴾ (البقرة: ٢٤٦) **واتە:** {ڕۆژێکـی بـە پێغەمبەرەکـەیان وت: تـۆ پاشـایەك، سـەرکردەیەکی شایستەمان بۆ دیاری بکە، تا لەژێر سەرکردایەتی ئەودا لە پێناوی خـوادا

بجەنگین دژی دوژمنان و ستەمكاران، پێغەمبەرەكەیان وتی: باشـە، ئـەی ئەگەر جـەنگتان لەسـەر بڕیـاردرا و خـەریك بـوو شـەڕ یەخـەتان بگرێـت، كەچـی پەشـیمانبوونەوە و نەجـەنگان، ئەوسـا چـی دەڵـێن؟!}، پاشـان خوای گەورە (طالوتی) كرد بە پاشایان: ﴿وَقَالَ لَهُمْ نَبِيُّهُمْ إِنَّ اللّهَ قَدْ بَعَثَ لَكُمْ طَالُوتَ مَلِكًا قَالُوَاْ أَنَّى يَكُونُ لَهُ الْمُلْكُ عَلَيْنَا وَنَحْنُ أَحَقُّ بِالْمُلْكِ مِنْهُ﴾ (البقرة: ١٤٧) واتە: {پێغەمبەرەكەیان بەوانەی كە ئامادەییـان تێـدا بـوو وتـی: ئـەوە ئـیتر خـوای گـەورە بڕیاریـداوە كـە (طـالوت) ئـەو پاشـا و سـەركردەیە بێـت، كەچـی هەنـدێكیان وتیـان: جـا ئـەوە چـۆن دەبێـت سەركردە و پاشای ئێمە بێت، كەی لە ئێمە شایستەترە بەوەی كە پاشا و سەركردە بێت..}.

لەڕاستیدا دەتوانین بڵێین نەوەی ئیسرائیل بەشێوەیەكی زۆر دیـاریكرا و لە مانای (حوكمڕانی خـوایی) تێگەیشـتبوون، ئـەوەتا كتـێبی ئاسمـانی دابەزیوە، لەگەڵ بوونی دەقێكی نووسـراو لـە نـاو تـابلۆدا (كـە باوەڕیـان وابـوو ئـەو تابلۆیانــە خـوای گــەورە بــە دەسـت و پەنجـەكانی خـۆی نووسیویەتی)، داوایشـیان لێ كـراوە جێبجێـی بكـەن و لەئەسـتۆی بگـرن، لەگـەڵ هـەموو ئەمانەشـدا پێغەمبـەرانیش نێـردران و هەڵسـان بـە كـاری بانگەواز و نێوەندگیری لەنێوان ئەوان و خوای باڵادەسـت .. بـەڵام ئـەوان هـەموویان هـاوڕابوون لـە تێڕوانینیـان بـۆ مـوعجیزەی بەخشـیش (كاتێـك داوای هەر شتێكیان دەكرد خوای گەورە بۆی جێبەجێ دەكردن) و لەگەڵ ئەو ڕێزگرتنە خواییە ڕاستەوخۆیە كە بریتیبـوو لـە (حـوكمڕانی خـوایی)، لەهەمانكاتیشدا هاوڕابوون لـە تێڕوانینیـان بـۆ ئـەو سـزا توونـدە لـەكاتی

رووداني هەر لادانێك لـە جێبـەجێكردني تـەورات و شـەريعەتدا، ئـەوەبوو كاتێـك كـە سـەردەمي پاشـايەتي و جێنشـين هاتـە پـێش لـە سـەردەمي "پێغەمبـەر داوود و پاشـان پێغەمبـەر سـولەيمان"دا هەنـدێكيان باريـان ڕاست بوويەوە، بەڵام هەر بە وەفاتي سولەيمان ئەوەی كە خـوای گـەورە بەئاگای هێنانەوە لێی: بەلاڕێدا چوون و لادان دەبێتە مايەی تياچوونيان، بەو شـێوەيەبوو، ئـەوەبوو لـە سـاڵی (٧٢١)ی پـێش زايـين ئاشـووريەكان پايتەختی يەكێك لە دوو شانشينەكەياني داگـير كـرد، كـە ئيسـرائيل بـوو خستيانە سەر ئيمپراتۆريەتەكەی خۆيان، "نەبوخوزنەسر"يش لـە سـاڵی (٥٨٧)دا دەستي گـرت بەسـەر مەملەكـەتي "يـەهوزا" و پەرسـتگاكەياني كـاول كـرد و خەڵكەكـەی بـرد بـۆ بابـل و كردنيـە كۆيلـە، ئـەوەش بوويـە سەرەتای قۆنـاغێكي نـوێ كـە چـەند سـەدەيەك درێـژەی كێشـا و تيايـدا نەوەی ئيسرائيل تێكەڵاوی هەموو گەلانی سەر زەوی بـوون و چـوونە نـاو هــەموو ئايينــە بتپەرســت و يەكتاپەرســتەكانەوە و باوەريــان بــەجۆرەها رێچـكە هێنــا، ئــەوەی تــا ئێســتاش دەگەڕێنــەوە و بــاس لــە "خــاكي چـــاوەڕوانكراو" دەكـــەن و دامەزرانـــدني مەملەكـــەتي ئيســـرائيل و راستكردنەوەی هەيكەل و گەڕانەوە بۆ ئەوەی كە باووباپيرانيان لەسـەری بوون لەسەر ئەو بناغەيەی كە خۆيان وايـان خسـتۆتە مێشـكي خۆيانـەوە ئەوە بەڵێنێكي خواييە و پێياندراوە، ئەوان دەبێت خاوەنداريتی ئەو خاكە پيرۆزە بكەن.

## سێهەم: حوکمڕانی خوایی لە تێڕوانینی جوولەکە و گاورەکانەوە

### ١- حوکمڕانی خوایی لە تێڕوانینی جوولەکەوە:

دەتوانین گرنگترین بنەما بنەڕەتیەکانی تێڕوانینی جوولەکەکان بۆ حوکمڕانی خوایی بەم شێوەیە دیاری بکەین:

**بنەمای یەکەم:** خوای گەورە گەلی خۆی بژاردەکرد لە نەوەکانی ئیسرائیل، ئەوەیشی بژاردەکرد کە خۆی راستەوخۆ حوکمڕانی ئەم گەلە بکات و لەنێو نەوەکانی ئەم گەلەدا پێغەمبەر و نێردراو دیاری بکات بۆ پەیوەندیکردن بەخۆیەوە، تا رێنماییەکان وەربگرێت و بیگەیەنێت بە گەل، کە بریتیە لەو رێنماییانەی لە "سفری یەکەم"ی سەردەمی کۆندا هاتووە، بەتایبەت لە هەردوو سیفری (دەرچوون و دوانەیی)دا، بەو پێیەی ئەم سیفرانە وتەی خواوەندن راستەوخۆ بۆ گەل، خوای گەورە "دە" وەسیەتەکەی لەسەر دوو تابلۆ کە خودی خۆی و بە دەستی خۆی نوسیویەتی و پێشکەشی پێغەمبەرەکەی کردووە کە مووسایە – سەلامی خوای لەسەر – بۆ گەیاندنی بە گەلە بژاردەکراوەکەی بەمەبەستی کارپێکردن و جێبەجێکردنی، ئەم یاسایەی کە هاتووە وتە و یاسای خوایە و هیچ کەس نە لە پێغەمبەران و نە لە نێردراوانیش کە هەڵگری پەیامی خوایین بۆ گەل ناتوانن و بۆیان نییە دەستکاری و گۆڕانکاری لە وتەی خوادا بکەن، یاخود شتێکی بۆ زیاد بکەن، یان کەمی بکەن، یان تەئویلی بکەن، بۆیە هیچ کەس جگە خوای گەورە، پێغەمبەر، نێردراو، حاکم ،

پیاوە ئایینیەکان، بۆی نییە هیچ بەشێك لە وتەکانی خـوا لـە تـەورات لـە کارپێکردن بخات، یان شتێکی تر لەجێگەی دابنێت، یان بۆی زیاد بکات.

**بنەمای دووەم:** ئەم حوکمڕانیە خواییـە، یـاخود ئـەم بژاردەیـە، گـەلی ئیسرائیل والێدەکات ببنە نزیکترین گەل لـەلای خـوای باڵادەسـت، بـەڵکو کردوونی بە خۆشەویست و نەوەی خواو هیچ کەس لەم جیهانەدا نـاتوانێ ببێتە هاوشانی ئەو گەلە لە پلە و پایـەدا، ئەمـەش سـیفەتێکی تایبـەتیان دەداتێ و دەیانکاتە گەلی بژاردەکراوی خوا، خاکەکەیشیان دەکاتە خاکی پـیرۆز بـەو پێیـەی خـوای گـەورە خـۆی پـیرۆزی کـردوون، لەڕاسـتیدا حـوکمڕانیکردن بـەم جـۆرە تێگەیشـتنە و بـەم شـێوازە لـەلایان روون و ئاشکرابوو پێش ئەوەی هەنگاو بنێن بەرەو قۆناغەکانی دواتر کـە بـریتین لە قۆناغی (قازیەکان)، پاشان قۆناغی (جێنشینەکان)، دواتـریش قۆنـاغی (پێغەمبـەرە پاشـاکان)، یـاخود (جێنشـینە پاشـاکان) وەك حاڵەتەکـەی سولەیمان پێغەمبەر، بۆیە دەکرێت بڵێین ئەم تێگەیشتنە زۆر روونترە لەو تێگەیشتنەی کە لە مێژووی جوولەکـەوە روون دەبێتـەوە، هـەروەها لـەو وێناکردنەی پێشتر ئامارەمـان پێکـرد، لەڕاستیشـدا چـەمکی (حـوکمڕانی خوایی) لە سیستمی ئایینی جوولەکـەدا، وەسـتاوە لەسـەر هەڵسـوکەوتی راسـتەوخۆی خـوایی لەگـەڵ گـەلێکی دیـاریکراو، کـە ئـەویش نـەوەکانی ئیسـرائیلە، ئـەوەبوو ئـەوەی کـە داوایـان کردبـوو لـە هـەر شـتێك کـە ویستبێتیان و ئارەزوویان بۆ کردبێت پێیداوون، لـە بەرامبـەر ئـەو پێدانـە سەرسوڕهێنەرەدا سزایەکی سەرسوڕهێنەریش هەیە لـەکاتی سەرپێچـی و لاداندا، چونکە پەیوەنـدی لەگـەڵ خـوای باڵادەسـت و گەلـە بژاردەکەیـدا

پەیوەندییەکی پەیمانداریی راستەوخۆیە، هەربۆیە تەوراتیش بەپەیمان ناونراوە، جیاوازی نییە ئەگەر وتمان پەیمانی کۆن یاخود پەیمانی تازە، چونکە ئەوە پەیمانە لەنێوان ئەوان و خوادا، هەروەك دەقەکان بەو شێوەیە وێنای دەکەن، وەك ئاماژەمان پێکرد.

بە بەدواداچوونکردن بۆ ئەم پرسە دەتوانین بگوازینەوە بۆ نیشاندەرێکی تری گرنگ، ئەویش ئەوەیە جوولەکە – پاش ئەو هەموو قۆناغە– زۆر سووربوون لەسەر ئەوەی کە خوای بالأدەست بوارە تەشریعیەکەیان لەسەر سووك بکات، وەك ئەو پلەبەندکردنە دوایەکانەی لە قۆناغی (حوکمڕانی راستەوخۆی خوایی) بۆ قۆناغی (حوکمڕانی نێردراوانی جێنشین)، پاشان بۆ قۆناغی (حوکمڕانی پێغەمبەرانی پاشا)، دوای ئەویش بۆ قۆناغی (حوکمڕانی پاشایانی ئاسایی)، بۆیە دەستیان کرد بە هەوڵدان بۆ بەدەستهێنانی ئەو ئاسانکردنە دوای ئەوەی بۆیاندەرکەوت زۆربوونی لادانەکانیان دەرەنجامی ئەو توندگیریە بوو کە شەریعەتی تەورات لەخۆی گرتبوو کە خوای بالأدەست پێی تاقی دەکردنەوە، بۆیە داوایان کرد لە خوای گەورە ئەرکەکان لەسەریان سووك بکات و سزایان لەسەر لابدات و ئاڕاستەی ئەرکەکانی سەرشانیان بگۆڕێت کە زیاتر لە زۆرەملێ و پاڵەپەستۆو توندکردن و سووربوون و کۆتوبەندکردندا خۆی دەنواند، بۆ ئەوەی گەلێك پابەند بکات کە نەدەتوانرا پابەند بکرێن بە هیچ شتێك بەبێ بەکارهێنانی ئەم رێکارانە، بۆیە داوایان کرد لە خوا لەسەریان سووك بکات.

له سورەتی (الأعراف) یشدا پاش کرداری هەڵگەڕانەوە بەکۆمەڵەکە کە بووە هۆی شکستی نەوەکانی ئیسرائیل، قورئانی پیرۆز ئەوەی تۆمار کردووە: ﴿وَاخْتَارَ مُوسَى قَوْمَهُ سَبْعِينَ رَجُلاً لِّمِيقَاتِنَا فَلَمَّا أَخَذَتْهُمُ الرَّجْفَةُ قَالَ رَبِّ لَوْ شِئْتَ أَهْلَكْتَهُم مِّن قَبْلُ وَإِيَّايَ أَتُهْلِكُنَا بِمَا فَعَلَ السُّفَهَاء مِنَّا إِنْ هِيَ إِلاَّ فِتْنَتُكَ تُضِلُّ بِهَا مَن تَشَاء وَتَهْدِي مَن تَشَاء أَنتَ وَلِيُّنَا فَاغْفِرْ لَنَا وَارْحَمْنَا وَأَنتَ خَيْرُ الْغَافِرِينَ * وَاكْتُبْ لَنَا فِي هَذِهِ الدُّنْيَا حَسَنَةً وَفِي الآخِرَةِ إِنَّا هُدْنَا إِلَيْكَ قَالَ عَذَابِي أُصِيبُ بِهِ مَنْ أَشَاء وَرَحْمَتِي وَسِعَتْ كُلَّ شَيْءٍ فَسَأَكْتُبُهَا لِلَّذِينَ يَتَّقُونَ وَيُؤْتُونَ الزَّكَاةَ وَالَّذِينَ هُم بِآيَاتِنَا يُؤْمِنُونَ * الَّذِينَ يَتَّبِعُونَ الرَّسُولَ النَّبِيَّ الأُمِّيَّ الَّذِي يَجِدُونَهُ مَكْتُوبًا عِندَهُمْ فِي التَّوْرَاةِ وَالإِنْجِيلِ يَأْمُرُهُم بِالْمَعْرُوفِ وَيَنْهَاهُمْ عَنِ الْمُنكَرِ وَيُحِلُّ لَهُمُ الطَّيِّبَاتِ وَيُحَرِّمُ عَلَيْهِمُ الْخَبَآئِثَ وَيَضَعُ عَنْهُمْ إِصْرَهُمْ وَالأَغْلاَلَ الَّتِي كَانَتْ عَلَيْهِمْ فَالَّذِينَ آمَنُواْ بِهِ وَعَزَّرُوهُ وَنَصَرُوهُ وَاتَّبَعُواْ النُّورَ الَّذِيَ أُنزِلَ مَعَهُ أُوْلَئِكَ هُمُ الْمُفْلِحُونَ﴾ (الاعراف: ١٥٥ ـ ١٥٧) واتە: {دوای ماوەیەك، کاتێك مووسا خەڵکەکەی سەرلەنوێ لە یەکخواناسی تێگەیاندەوە، حەفتا پیاوی لە قەومەکەی هەڵبژارد (تا پێکەوە بچن بۆ لای کێوی طور و لەوێ بەندایەتی خۆیان لە جیاتی هەمووان دووپات بکەنەوە و پەشیمانی دەربڕن) کەچی کوتوپڕ بومەلەرزەیەك ڕوویدا و ترسێکی زۆری فرێدایە دڵیانەوە، مووسا وتی: پەروەردگارا، تۆ ئەگەر بتەوێت هەموویان بە منیشەوە لەناو دەبەیت، مەگەر ڕەحمەت و میهری تۆ بەو شێوازەیە کە بە هۆی تاوانباران و نەفامانمانەوە ئێمەش لەناو بەریت؟! وادیارە ئەمەش تاقیکردنەوەیەکی تری زاتی تۆیە، کە بەهۆیەوە هەندێ کەس کە بتەوێت و (خۆیشیان تۆوی

بێئیمانی لـە ناخیانـدا هـەبێت) گـومڕا و سـەرگەردان دەکـەیت، هـەروەها هەنـدێکی تـریش کـە زاتـی تـۆ بتـەوێت هیدایـەت و ڕێنمـویی دەکـەیت (خۆیشـیان دڵیـان ئامـادەیی تێدایـە بـۆ پـەیڕەوی فەرمانـەکانی زاتـی شکۆمەندی تۆ)، دیارە هەر زاتی تۆ پشت و پەنای ئێمەیە، بۆیە داواکارین کە لێمان ببوریت و بەزەییت پیاماندا بێتەوە، چونکە زاتی تۆ چاکترین و پیرۆزترین پەروەردگارێکە لـە چاوپۆشـین و لێخۆشـبووندا لـە بەنـدەکانی (کـاتێ هەڵـە دەکـەن و پاشـان پەشـیمانی دەردەبـڕن)، خوایـە گیـان! داواکارین لە زاتی خاوەن میهرتان کە لە دنیادا خێر و چاکەمان بـۆ پـێش بهێنن، هەروەها لە قیامەتیشدا خێر و چاکەمان پێ ببەخشیت، لەڕاستیدا ئیتر ئێمە بە تەواوەتی ڕێنمویی کراوین بۆ پەرستنی تەنها زاتی تۆ، خوای گەورەش لە وەڵامیاندا فەرمووی: من سزا و تۆڵەی خۆم بەسەر کەسـێکدا دەدەم کە خۆم دەمەوێت و (ئەویش شایستەیە)، بەڵام ڕەحمەت و سۆز و میهرەبانیم هەموو شتێکی گرتۆتەوە، تۆماریشی دەکەم بۆ ئەو کەسـانەی کە تەقوادار و دیندارن و خۆیان دەپارێزن لەو شتانەی کـە مـن قەدەغـەم کردووە، ئەوانەی کە زەکاتی ماڵ و سامان و هەرچـی شـتێك کـە هەیانـە دەیبەخشن، بە هەموو بوارێکی خێر و چـاکە، ئەوانـەی کـە باوەڕیـان بـە هەموو ئایەت و فەرمانەکانی ئێمە هەیە، هەروەها ئەوانەی کە لە ئایندەدا باوەڕ دەکەن بە پێغەمبەر و فرسـتادەی نەخوێنـدەوارمان (محمـد ﷺ)، جوولەکە و مەسیحیەکانیش ناونیشانەکانی دەبیـنن کـە تۆمـار کـراوە لـە تـەورات و ئینجیلـدا (لەگـەڵ دەستکاریکردنیشـیدا) کـە هەنـدێ سـیفاتی ئەوەیە: فەرمانیان پێدەدات بە چاکە و چاکەکاری، هەرچی شتێکی چـاك

و پاك و بەسوودە بۆیان حەڵاڵ دەكات، هەرچی شتێكی پیس و خراپ و ناپوختە لێیان حەرام دەكات، ئەركە قوورس و سەنگینەكان لەسەرشانیان لادەبات، ئەو كۆت و زنجیرانەش كە لە گەردنیاندا بوو (بەهۆی لادان و یاخیی بوون و گوناهەكانیانەوە، وەكو خۆكوشتن بۆ ئەوەی تەوبەیان گیرا بێت) لای دەبات، جا ئەوانەی باوەڕی پێ دەكەن و پشتیوانی ئاین و بەرنامەكەی دەكەن و شوێنی ئەو نوورە دەكەون (كە قورئانە) و بۆ ئەو نازڵ كراوە، هەر هەموو ئەوانە سەرفراز و ڕزگار و سەركەوتوون لە هەردوو جیهاندا}، ئەم ئایەتە پیرۆزانە و ئایەتەكانی كە بە (قل یا ایها الناس انی رسول الله..) كۆتاییان پێ هاتووە بۆمان روون دەكەنەوە كە ئاواتی مووسا ـ سەلامی خوای لەسەر ـ و گەلەكەی چۆن بووە، بۆ ئەوەی شەریعەتیان لەسەر سووك بكرێت تا بەرگەی بگرن و كاری پێبكەن و جێبەجێی بكەن، بەڵام دانایی خوا وای بە پێویست گێڕا كە ئەو سووككردنە بكاتە تایبەتمەندی كۆتا شەریعەت و كۆتا پەیامی جیهانی، نەك تایبەتی بكات بۆ ئەو گەلەی كە بە بەردەوامی لە هەڵگەڕاندنەوە و دوركەوتنەوە و لاداندا بوون و هەموو پابەندبوونێك بەو شەریعەتەی كە بۆیان هاتووە رەت كردۆتەوە، لەكاتێكدا ئەو شەریعەتە بووتە هۆكاری یەك بوون و یەكخستنیان لە پەرتەوازەیی و دەرهێنانیان لە سەرشۆڕی پەرستنی جگە خوا، بەڵام ئەو گەلە هەموو ئەو نیعمەتانەی كە خوا رشتبووی بەسەریاندا نەیانبینی و رەچاوی مافی خوایان نەكرد لەسەر هەموو ئەو نیعمەتانە.

لـەوەی کـە رابـوورد هەنـدێك لـە جێکەوتـەکانی چـەمکی (حـوکمڕانی خوایی)مان لـە عـەقڵی جوولەکـەدا بـۆ دەردەکـەوێت، کـە ئـەو چـەمکە و تارماییەکەی رەنگدانـەوەی هـەبووە لەسـەر هـەموو لایەنـەکانی ژیانیـان، کاریگەری هەبووە لەسەر تێڕوانینی گشتی و بینینیان بۆ مرۆڤایـەتی، بـۆ شەریعەت، بۆ گەردوون، بۆ ژیـان، بـۆ یەکتاپـەرسـتی، بـۆ خوایـەتی و بـۆ سیستمی گشتی، هەموو ئەم شتانە لەژێر کاریگەری جۆری تێگەیشـتنیان بووە بۆ (حوکمڕانی خوایی).

## ٢- حوکمڕانی خوایی لای نەصرانییەکان:

لەپاش ئەو جێکەوتەیـەی کـە لـەدەرەنجامی کاریگـەری دانـان لەسـەر عەقڵی جولەکە لە هەموو ئەو تۆڕە چەمکانەی کە خستبوونیە حاڵـەتێکی پشـێوی، پشـێوی لـە پەیونـدی بـەخواوە، پشـێوی لـە پەیوەنـدی بـە گەردوونەوە، پشێوی لە پەیوەندی بە خۆوە، پشـێوی لـە پەیوەنـدی بـە پێغەمبەرەکانیان، پشێوی لە پەیوەندی بـە دراوسـێکانیان پێویسـتیەکی زۆر هـەبوو بـۆ هـاتنی پێغەمبـەر و پـەیامێکی تـر تـا هەسـتێت بـە کـاری راستکردنەوە و رێککردنەوەی ئەو کاریگەرییانە، بۆیە خوای گەورە عیسا پێغەمبەری نارد تا رێنماییان بکات هەروەك دەڵێن هیدایەتی (مەڕی ونبوو لـە نـەوەکانی ئیسـرائیل) بـدات، بـۆ ئـەوەی ئـەو راسـتیەی کـە لـەنێو دەستیدایە بسەلمێنێت تا هەستێت بە کاری گەڕاندنەوە و پاککردنـەوە و رێککردنەوە و جیاکاری لەنێوان چاك و خراپدا، عیسای کوڕی مەریەمیش

– سەلامی خوایان لەسەر– نێردرا بۆ ناو نەوەکانی ئیسرائیل تا راستێتی ئەو تەوراتەی کە لەبەردەستیدایە بسەلمێنێت و هەندێ لەو شتانەی کە حەرام کرابوو لەسەریان بۆیان حەڵاڵ بکات، مزگێنیش بداتە هەموو خەڵك بەو مژدە جیهانیە گشتگیرە کە هاتنی کۆتا پێغەمبەرە بە شەریعەتێکی ئاسانکراوو پڕ لەسۆز، ئەوە عیسا پێغەمبەرە –سڵاوی خوای لەسەر– دانی نا بەوەی کە لە تەوراتدا هاتووە، دەفەرموێ: (وا بیرنەکەنەوە من هاتبم تا تەورات یان پێغەمبەران پووچەڵکەمەوە، نەهاتووم بۆ پوچەڵکردنەوە، بەڵکو بۆ تەواوکردن، راستتان پێدەڵێم: تا زەوی و ئاسمان لەئارادا بێت، پیتێك یان خاڵێك لە تەورات لەناو ناچێت، تاکو هەمووی دێتە دی) ئینجیلی مەتا / ٥.

بەڵام ئەم جەختکردنەوەیەی کە لەلایەن گەورەمان مەسیحەوە دەربارەی ئەوەی کە ئەو تەنها بۆ ئەوە هاتووە سەرلەنوێ وشەکان دەربارەی تەورات یەکبخاتەوە و فێریان بکات چۆن بەراستی و بە دروستی جێبەجێی دەکەن، لە ئینجیلەکاندا راستکردنەوەی زۆر دەربارەی هاتووە، بۆ نموونە: ئینجیلی مەتا (٤/٤)، هەروەها ئەوەی هاتووە تیایدا لە (٤٧/٢٢ تا ٤٠)، هەروەها لە ئینجیلی لۆقایشدا هەندێ لەو بارەیەوە هاتووە (١٧/١٦)، کە ئەمەش ئاماژەیەکی روونە بۆ ئەوەی گەورەمان مەسیح هەوڵیداوە دەسەڵاتی تەورات بکات و بانگەوازی کردووە بۆ پابەندبوون بەوەی کە تەورات هێناویەتی و خەڵکی فێری چۆنیەتی جێبەجێکردنی کردووە بە شێوەیەکی راستگۆیانە بەبێ گوێدانە ئەو بارودۆخەی کە لەوانەیە ببێتە رێگر لەنێوان ئەو و لەنێوان جێبەجێکردنی

زۆرێك له رێنماییەکانیدا، لـه هەمانکاتیشـدا جەختکردنەوەیـە لـەوەی کـە خراپ تێگەیشتوون لـە دەقـەکانی تـەورات و رۆح و نـاوەڕۆکی تـەوراتیان پشتگوێخسـتووە، یـان لـەبیری خۆیـان بردۆتـەوە و تـەنها دەسـتیان بـە دەقەکانی تەوراتەوە گرتووە، بۆیە هەوڵ دەدات تێگەیشتن له تەورات به رۆح و دەقـەوە بگێڕێتـەوە بـۆ عـەقڵ و هزریـان، نـەك تـەنها بـە دەق، لەبەرئەوە کاتێ شتێکیان ئەوروژاند یان هەندێ کاروباریان لەگەڵ تاوتوێ ئەکرد، ماناکەی لەم جۆرە تێگەیشتنەوە نزیك بوو، زۆرجـار هـەوڵی ئـەدا نموونـەیان بـۆ بهێنێتـەوە، بۆچـوونیان بـەرەو رۆح و نـاوەڕۆکی کارەکـە بجوڵێنێت، ئەوەتا له ئینجیلی مەتاو لۆقـادا دەڵێـت: (بیسـتوتانه وتـراوە چاو لەبری چاوە و ددان لەبری ددانە، بەڵام من پێتان دەڵێم: رووبـەڕووی هەڵە مەبنەوە، بـەڵکو ئەگـەر یـەکێك زللەیـەکی دا لـە لای راسـتت لاکـەی تریشتی بدەرێ) [(1)].

ئەم وتەیە و وتەکانی تریش ئەوەی لێوە تێدەگەین که عیسا –سەلامی خوای لەسەر– دەیەوێت گەلەکەی دورخاتەوە له گیانی تۆڵەسەندنەوە – لەگەڵ ئەوەشدا له شەریعەت و له تەوراتیشدا هاتووە– بەڵام کارەکه بـەو جۆرە نییە، بەڵکو هەوڵدانێکه بۆ چارەسەرکردنی دۆخەکـە، وەك ئـەوەی پێیان بڵێت: (خۆتان شەتەك مەدەن به دەقـەوە، بـەڵکو هـەوڵ بـدەن لـە رۆحی تەورات حاڵی ببن، بـەو شـێوەیەی وەك ئێسـتا بەپارچـە پارچـەیی لێی تێمەگەن، بەڵکو هەوڵبدەن به شێوە تەواو و گشتیەکەی لێی تێبگەن

---

١ ئینجیلی مەتا (٣٩/٥)، ئینجیلی لوقا (٢٩/٦).

لەگەڵ تێبینیکردنی ئامانجەکانی، هەروەها هەوڵیدا لێرەدا جیاوازی بکات لەنێوان سیستمی گشتی و هەژموونی شەریعەت (کە ئەم دوانە پێویستە لەسەر هەموومان پابەند بین پێیانەوە و ڕێزیان لێ بگرین) و مافی تاکەکان و پرسە تایبەتەکانیان کە پێویستە گیانی برایەتی و لێبووردەیی باڵبکێشێت بەسەریدا، ئەگەر تێبینی ئەمە بکرێت و لەگەڵیشیدا تێبینی ئەو بارودۆخە بکەین کە عیسا پێغەمبەری تێدا هات و هەژموونی ڕۆما و یاساکانی لەو قۆناغەدا و پەرتەوازەبوونی نەوەکانی ئیسرائیل و کارپێنەکردنی شەریعەتی تەورات لە هەموو ئەو شوێنانەی کە تێیدا دەژیان، ئەمانە هەموو ئاماژەیەکی روونن و یارمەتیمان دەدەن تێبگەین لە زۆرێك لەو دەستەواژانەی وا لێیان تێگەیشتبووین کە هیچی نەهێناوە لەگەڵ خۆی پەیوەندی بە شەریعەتەوە هەبێت، بەڵکو تەنها پەیوەندی بە پرسی بیروباوەڕ و راستکردنەوەی رەوشت و بنیاتنانەوەی رەوشتەوە هەبووە ئەگەر دەستەواژەکە راست بێت.

لێرەدا دەبێت تێبینی هەندێك شتی گرنگ بکەین، لەوانە: عیسا – سەلامی خوای لێبێت– جەختی دەکردەوە لە باڵادەستی تەورات و لەسەر نادروستی راگرتنی هیچ کام لە حوکمەکانی تەورات، نادروستی گۆڕین و دەستکاریکردنی رێنماییەکانی، بەڵام – لەهەمانکاتدا – هەوڵی دەدا بە شێوەیەك لە شێوەکان بەرچاوڕوونییەك پێشکەش بکات بۆ جێبەجێکردنی بەشێوەیەکی دروست، هەروەها هەوڵی دەدا رێگاکان دابخات لەبەردەم هەموو ئەو رووهبان و ئەحبارانەی جوولەکەدا کە دەستیان تێکەڵ کردبوو لەگەڵ کاربەدەستانی رۆم و دانیان نابوو بە دەسەڵاتەکەیاندا، دەیانویست

شەریعەت دەستەمۆ بکەن لە ڕێگای دەستکاریکردنی دەقەکانی تەورات و تەئویلکردنی بەشێوەیەك لەگەڵ خواستەکانی ئەواندا بگونجێت، لەڕاستیدا گەورەمان عیسا (سەلامی خوای لەسەر) کۆششی کرد تا دەرگایەك بکاتەوە بۆ تێگەیشتنێکی دروست لە دەقەکانی تەورات، بەڵام جوولەکەکان کاتێك چوون بۆ لای دەسەڵاتداری ڕۆم، چەند تۆمەتێکیان دایە پاڵی، لەوانە: (تۆمەتی ئەوەی کە هانی خەڵکی داوە بۆ دژایەتیکردنی دەسەڵات و یاخیبوون و نەدانی باج بە قەیصەر و دەربارەی خۆیشی دەڵێت من "پاشا مەسیح"م، بۆیە کاتێك (بیلاتس) پرسیاری لێکرد: تۆ پاشای جوولەکەیت؟ لە وەڵامیدا وتی: تۆ وا دەڵێیت). ئینجیلی مەتا بەشی ٢٧، گێڕانەوەکەی لۆقا جیاوازە لە گێڕانەوەی ئەمەی پێشوو، ئەو دەڵێت: (دەسەڵاتدارە ڕۆمیەکە دوای ئەوە راستەوخۆ بە جوولەکەکانی وت: من هیچ شتێك لە تاوان لەم پیاوەدا شك نابەم، بەڵام جوولەکەکان دووپاتیانکردەوە و وتیان: گەل دەوروژێنێت، لە هەموو یەهودیا خەڵك فێر دەکات، دەسپێك لە جەلیلەوە تاکو ئێرە)، [1] (ئینجیلی لوقا بەشی ٢٣).

[1] ئینجیلی لۆقا بەشی ٢٣. لە ١- ئینجا هەموو کۆمەڵەکەیان هەڵساند و بردیاننە لای بیلاتۆس. ٢- دەستیان کرد بە سکاڵاکردن لێی، دەیانووت: بینیمان ئەمە گەلەکەمان چەواشە دەکات و بەربەرەکانێی سەرانەدان دەکات بۆ قەیسەرو خۆی بە مەسیح ناودەبات. ٣- پاشا بیلاتۆس لێی پرسی: تۆ پاشای جوولەکەی؟ وەڵامی دایەوە: تۆ دەڵێی. ٤- بیلاتۆسیش بە کاهینانی باڵاو خەڵکەکەی وت: هیچ تاوانێك لەم پیاوە نابینم. ٥- بەڵام مکوڕبوون و وتیان: گەل دەوروژێنێت، لەهەموو یەهودیا خەڵك فێردەکات، دەسپێك لە جەلیلەوە تاکو ئێرە. ٦- کاتێ بیلاتۆس ئەمەی بیست، پرسیاری کرد ئاخۆ پیاوەکە جەلیلیە. ٧- کە زانی عیسا سەر بە دەسەڵاتی هیرۆدسە، بۆ هیرۆدسی نارد، کە لەو ڕۆژانەدا ئەویش لە ئۆرشەلیم بوو. ٨- کاتێ هیرۆدس عیسای بینی، زۆر

لەبەر ئەوە بیلاتس – کە باوەڕی بە تاوانباری مەسیح نەبوو– ڕێکارێکی تری دۆزیەوە، بۆیە ناردی بۆ لای دەسەڵاتداری شاری جەلیل لەبری ئەوەی خۆی بکەوێتە نێو ئەو کارەوە، بۆ ئەوەی ئەو کاروباری دادگاییکردنەکەی لەئەستۆ بگرێت، ئەو گفتوگۆیەش کە ڕوویدا لەنێوان حاکمی رۆمی و گەورەمان مەسیح ئەوەی لێوە تێبینی ناکرێت لە بواری (دەسەڵات)، یاخود دەربارەی پرسی (حاکمیەت) بێت لەڕوانگەی وەڵامەکەیەوە کاتێك دەسەڵاتدارە رۆمیەکەی پێی وت: نابینی من دەسەڵاتی ئەوەم هەیە بەرەڵات بکەم یان هەڵتواسم؟ وەڵامی دایەوە و فەرمووی: (تۆ بەهیچ شێوەیەك دەسەڵاتت بەسەر مندا نییە مەگەر لەسەرەوە پێتدرابێت)[1]، ئەم قسەی مەسیحیان وا لێکداوەتەوە کە جەختکردنەوەیە لە بنەماکانی تەورات، یان پەیمانی کۆن، ئەویش ئەوەیە کە "حوکم" تەنها بۆ خوای بالادەستە و دەیسپێرێت بە هەرکەسێك کە خۆی بیەوێت، یاخود هەر کەسێك کەبیەوێت دەیکاتە جێنشینی خۆی، بولس قدیسیش لە دوتوێی ئەو نامەیەیدا کە ناردویەتی بۆ خەڵکی رۆما جەختی لەمە کردۆتەوە (١٣/١)، دەڵێت: با هەموو کەسێك لەئێوە

---

دڵخۆش بوو، چونکە دەمێك بوو چاوەڕوانی بینینی بوو، چونکە لەمەڕ ئەوی بیستبوو و بە ئومێد بوو ببینێت، نیشانەیەك بەهۆی ئەو بێت. ٩– جۆرەها پرسیاری لێکرد، بەڵام هیچ وەڵامی نەدایەوە. ١٠– کاهینانی باڵا و ماملەکانیش ڕاوەستان و بەتوندی سکاڵایان لێکرد. ١١– هێرۆدس و سەربازانی سووکایەتی و گاڵتەیان پێ دەکرد، جلێکی بریسکەداریان لەبەری کرد و ناردیانەوە بۆ بیلاتۆس.

[1] سەیری ئەو وتووێژە بکە لە ئینجیلی یوحەننا: بەشی ١٩.

ملكەچی فـەرمانڕەوا دەسـەڵاتدارەكان بێـت، چـونكە دەسـەڵات نییـە لـە خواوە نەبێت، جا ئەوەی هەیە لەلایەن خواوەیە، ئیتر ئەوەی بەرهەڵستی دەسەڵات دەكات، بەرهەڵستی دانـراوی خـوا دەكـات، بەرهەڵسـتكارانیش خۆیان حوكم بەسەر خۆیاندا دەدەن. (بەشی ١٣).

دەكرێت بتوانین ئەمەنـدە بڵـێین دەربـارەی چـەمكی (دەسـەڵاتدارێتی خـوایی) ئەوەنـدەی كـە پەیوەنـدی هـەبێت بـە گاورەكـان و مەسـیحی پایەبەرز، لەڕاستیدا ئەو جەختی دەكردەوە لەوەی لە تەوراتدا دەربارەی ئـەم چـەمكە هـاتووە، ئەمـەش هـەولێك بـووە بـۆ بـەهێزكردنی پێگـە و دەسەڵاتی تەورات و شەریعەتی خوایی بەرامبەر دەسەڵاتی رۆمـەكان، لـە سایەی ئەو یاسایانەی كە خۆیان دایاننابوو بۆ خۆیان، بواریان نەدەدا بـە هیچ شتێكی تر – نە بە شـەریعەتی تـەورات و نـە بـە شـەریعەتێكی تـر– سـەردەربێنێت، یـاخود كـاری پێبكرێـت، یـاخود بەرپەرچـی ئـەو یاسـا دەستكردە رۆمانیانە بداتەوە، پاشانیش عیسا –سەلامی خـوای لەسـەر– هـــەوڵی دەدا رۆڵ بگێڕێتـــەوە بـــۆ شـــەریعەت و بنـــەماكانی و ڕێســـاو مەبەسـتەكانی، بـەڵام لـە سـایەی رووبەڕووبوونـەوە و فشـاری لایـەنی رۆمەكان، نەوەك لە سایەی كەشێكی ئازاددا رێگای پێ بـدرێت بـە مـەیلی خۆی هەڵسوكەت و جموجوڵ بكات پڕاوپـڕی ویسـتی خـۆی، بـە بەڵگـەی ئەوەی –هەروەك ئاماژەمان پێكرد– تۆمەتباریان كرد و پاشان دادگاییان كـرد، زۆریشـی نـەمابوو لـە خاچـی بـدەن ئەگـەر خـوای باڵادەسـت نەیپاراسـتایە، بۆیـە پێویسـتە تێبینـی هـەموو ئـەو لایەنانـە بكـەین كـە گەورەمان مەسیح پێی هەڵساوە و هەموو ئەو ڕێسا و بنەمایانـە لێـك جیـا

بکەینەوە کە ئەو چەمکەی لەسەر راگیراوە و روونی بکەینەوە و دەری بخەین. لەوانەیە سوودمەند بێت ئەگەر کۆتایی قسەکانمان دەربارەی (دەسەڵاتدارێتی خوایی) لەلای نەوەکانی ئیسرائیل بهێنێت بە هەندێك دەق کە (ئیبن مەیمون) لە تەوراتەوە نەقڵی کردوە و راڤەی کردوە، لەوانەیە تێڕوانینمان بۆ ئەم باسە روونتر بکاتەوە:

ئیبن مەیمون دەڵێت: هەروەها لەمبارەیەوە رێسایەکی دانا کە تائێستاش بەردەوام روونی دەکەمەوە، ئەویش ئەوەیە کە هەموو پێغەمبەران جگە گەورەمان مووسا (سڵاوی خوای لەسەر) سرووشیان لەسەر دەستی یەکێك لە فریشتەکاندا بۆ دەهات و فێریان دەکردن، بەڵام مووسا (سڵاوی خوای لەسەر) پێغەمبەرایەتیەکەی جیاوازبوو لەوانی پێش خۆی، ئەم خوای گەورە خۆی نیشانی دەدا هەروەك چۆن خۆی نیشانی "ئیبراهیم" دا و ناوی خۆی بۆ ئاشکرا نەکرد، بەڵام بۆ مووسای ئاشکرا کرد، راوەستانیش لە کێوی سینا بۆ هەموو ئەوانە نەبوو کە پەیوەست بوون بە مووسا (سڵاوی خوای لەسەر)، ئەو لەبری هەموو نەوەکانی ئیسرائیل بوو کە پەیوەست بوون پێوەی، بەڵکو ڕووی گوتاری تەنها لە مووسا بوو، لەبەرئەوە ئەو گوتارەی کە دەربارەی ئەو (١٠) فەرمانەی کە دابەزی هەمووی بەتەنها روی لە ئەو بوو، ئەو دەهاتە خوارووی کێوەکە و ئەوەی کە دەیبیست لە دەقەکانی تەورات پێی رادەگەیاندن: (من لەو کاتەدا رادەوەستام لەنێوان خوا و ئێوەدا تا وتەکانی خواتان پێ ڕابگەیەنم)، هەروەها دەفەرموێت: (مووسا قسان دەکات، خوایش بە دەنگ وەڵامی دەداتەوە تا خەڵك گوێبیستی ئاخاوتنی من بن لەگەڵ

تـۆ)[1]، هـەروەك (ئـیبن میمـون) دەڵێـت ئەمـە بەڵگەیـە لەسـەر ئـەوەی قسەکانی ئاڕاستەی ئەو بووە و ئەوان تەنها گوێبیستی دەنگەکە دەبـوون نەك درێژەی قسەکان.

(ئیبن مەیمون) لێرەدا دەیەوێت پەیوەندی نێوان خوا و گەلەکـەی کـە ئیسرائیلە و ئەو خاکە پیرۆزەی کە تێیدا نیشتەجێ بووبوون دەربخات، لە تێڕوانینی ئەو و تێڕوانینی زانایانی نەوەی ئیسرائیل ئەو شوێنە بریتیە لە (مەملەکەتی خوا)، ئەمەش بەمانای ئەوەی: زەوی، گەل، دەسەڵات خوای باڵادەسـتە، پێغەمبـەرانیش لـە سـەردەمی مووسـادا گەیەنـەری پـەیامن: کەواتە (حوکمڕانی رەها بۆ خـوای باڵادەسـتە)، هەرچـی پێغەمبەرانیشـە تەنها راگەیەنەرن وەك ئەوەی دەنگـی خواوەنـدی دروسـتکار دەگەیەننـە گـوێی خـەڵك لـە هـەر بڕیارێکـدا، ئەمـە ئەوەنـدەی پەیوەسـت بێـت بـە سەردەمی مووسا، بەڵام داوود – سەلامی خـوای لەسـەر– پێغەمبـەرێکی جێنشـین بـوو، سـولەیمانیش –سـەلامی خـوای لەسـەر – ئـەویش جێنشینێکی خاوەن مەملەکەت و پەیام بوو، قۆرئانی پیرۆزیـش ئامـاژەی بەمە کردووە و دەفەرموێ: ﴿يَا دَاوُودُ إِنَّا جَعَلْنَاكَ خَلِيفَةً فِي الْأَرْضِ فَاحْكُم بَيْنَ النَّاسِ بِالْحَقِّ وَلَا تَتَّبِعِ الْهَوَى فَيُضِلَّكَ عَن سَبِيلِ اللَّـهِ إِنَّ الَّـذِينَ يَضِـلُّونَ عَن سَبِيلِ اللَّهِ لَهُمْ عَذَابٌ شَدِيدٌ بِمَـا نَسُـوا يَـوْمَ الْحِسَـابِ﴾ (ص: ٢٦) واتـە: {ئـەی داود: ئێمـە تۆمـان کـردووە بـە جێنشـین لـەو وڵاتـەدا، هەمیشـە هەوڵبدە فەرمانڕەوایی لە نێو خەڵکیدا لەسەر بنچینەی حـەق و ڕاسـتی و

[1] ئیبنو مەیمون، مووسا. کتێبی "دلالة الحائرین" ل ٣٩١ و لاپەڕەکانی دواتریش.

دادپەروەری ئەنجام بدە، هەرگیز نەکەیت شوێنی ئارەزوو بکەویت..}، کە بریتیە لەو حوکمڕانیەی کە دامەزرابێت لەسەر دەسەڵاتی جێنشینی بۆ خوا، بەڵام پێغەمبەر جێنشینە، بەشێوەیەك ئەگەر هەڵەی کرد لە حوکمەکەیدا یاخود لەگەڵ راستیدا یەکی نەدەگرتەوە خێرا راست دەکرایەوە، بۆ ئەم مەبەستە چیرۆکی (تَسَوَرُ المحراب) و هاتنی هەردوو سکاڵاکارەکە بۆ لای داوود -سەلامی خوای لەسەر- هەروەك قورئانی پیرۆز باسی کردوە و تەوراتیش ئامـاژەی پێداوە بەئاگاهێنەرەوەن بۆ ئەمە، بەهەمانشێوە فەرمایشتی خوای گەورە: ﴿فَفَهَّمْنَاهَا سُلَيْمَانَ﴾ (الأنبياء: ٧٩) واتە: {ئێمە سولەیمانمان چاکتر تێگەیاند و قولتر بیری کردەوە..} وەك ئەوەی خوای دروستکار بیەوێت پێغەمبەرە جێنشینەکانی بەرەو ئەوە راستەوخۆ ئاراستە بکات، پاشان دوای ئەمە داوای موڵکیان کرد، ئەوانیش هاوشێوەی پێغەمبەرە جێنشینەکان موڵکیان هەبێت، دیسان داوای موڵکیان کردو تا ئەمانیش وەك خەڵك موڵکیان هەبێت، هەروەك لەسەرەتاوە ﴿قَالُواْ يَا مُوسَى اجْعَل لَّنَا إِلَهًا كَمَا لَهُمْ آلِهَةٌ قَالَ إِنَّكُمْ قَوْمٌ تَجْهَلُونَ﴾ (الأعراف: ١٣٨) واتە: {..وتیان: ئەی مووسا خوایەکیش بۆ ئێمە ساز و دیاری بکە هەروەکوو ئەوان..}، کاتێك کە بتەکانیان بینی، لەمەشدا ئاماژە و بەڵگەیە لەسەر ئەندازەی خۆشویستنی گەلی جوولەکە بۆ لاساییکردنەوە و کاریگەری لەسەریان و تەواوی ئامادەییان بۆ لاساییکردنەوەی گەلانی تر، بۆیە داواکارییان بۆ خاوەنداریێتی یەکێکە لە ئارەزووەکانیان بۆ لاساییکردنەوە بەبێ گوێدانە جیاکاری لەنێوان دروست و نادروستدا.

راستی کارەکە ئەوەیە خوای باڵادەست گەلی جوولەکەی هەڵبـژارد تـا حوکمڕانی خوایی بەوان ئەنجام بدات، بەهۆی ئـەوەی ئـەم گەلـە سـتەم و چەوساندنەوەیەکی زۆریان بینی ﴿إِنَّ فِرْعَوْنَ عَلَا فِي الْأَرْضِ وَجَعَلَ أَهْلَهَا شِيَعًا يَسْتَضْعِفُ طَائِفَةً مِّنْهُمْ يُذَبِّحُ أَبْنَاءهُمْ وَيَسْتَحْيِي نِسَاءهُمْ إِنَّهُ كَانَ مِنَ الْمُفْسِدِينَ﴾ (القصص/٤) **واتە:** {لەڕاستیدا فیرعەون خـۆی بڵنـد کـردەوە لەسـەر زەمینـی مەملەکـەتی میسـردا، خەڵکەکەشـی دەستەدەسـتە و پارچەپارچـە کـرد، دەسـتەیەکی هـەر زۆر دەچەوسـاندەوە و دژایـەتی دەکردن فەرمانی سەربڕینی هەموو منداڵێکی ساوای نێرینەیانی دەرکـرد، کچانیشی دەهێشتەوە بە ڕاستی ئەو ستەمکارە لەو کەسانە بوو کە تۆوی فەسادیان دەچـاند} ، ئـەوەبوو خـەڵکانێك حـوکمی کـردن لـە مرۆڤایـەتی داڕنرابوون وەك فیرعەون و هامان و قاروون، یەکەمیان پێی وتـن: ﴿وَقَالَ فِرْعَوْنُ يَا أَيُّهَا الْمَلَأُ مَا عَلِمْتُ لَكُم مِّنْ إِلَهٍ غَيْرِي﴾ (القصـص: ٣٨) واتـە: {فیرعەون وتی: خەڵکینە من وانازانم کە خوایەکی ترتان هەبێت جگە لـە من} ، هەروەها پێی وتن: ﴿فَقَالَ أَنَا رَبُّكُمُ الْأَعْلَى﴾ (النازعـات: ٢٤) واتـە: {خەڵکینـە ! ! مـن پـەروەردگاری هـەرە بـەرز و بڵنـد و پایـەداری ئێوەم ! ! .} ، ئەم ستەمکارانە بەردەوام بۆ ماوەی چەندین ساڵ حـوکمی ئەم گەلەیان کرد تا وایان لێهاتبوو هەستی مـرۆڤ بوونیـان لەدەستدابوو، وایاننەدەزانی کە دەتوانن بەرەوڕووی ئەم سـتەمکارانە و سـەربازەکانیان ببنەوە.

کاتێ خوای باڵادەست ویسـتی منـەتی خـۆی بـڕژێ بەسـەریاندا و لـەو لاوازیـە رزگاریـان بکـات و بیانکاتـە گـەلێکی شـکۆمەند و میراتگـر..

پێشـــەوایەتی و ســـەرکردایەتیان پێببەخشـــێت تـــا فیرعـــەون و دەستوپێوەندەکەی و هامان و قاروون لەسەر دەستی ئەماندا والێبکات هەستبکەن بە ئەندازەی بێ نرخی خۆیـان و سـووکی ئـەوان لـەلای خـوا، ئـەوەبوو مووسـای وەك پێغەمبـەرێکی پەیامـدار و وەك سـەرکردەیەکی نەتەوەیی رزگاریکاری بۆ ناردن، تا لە پەرستنی بەندە دەریانبهێنێت بۆ پەرستنی خوا، بۆیە خوا ئەو منەتەیشی بەسەردا کـردن کـە خـۆی بوویـە دەسەڵاتداریان لەبری ئەوان، چونکە ئەو ماوەیە ماوەیەکی راگوزەریـە لـە دەسەڵاتدارێتی کەسێکی بەندە بۆ دەسەڵاتدارێتی خواوەنـدی تـاك، بۆیـە پێویسـتی بـە جۆرێـك لـە پاککردنـەوەی نـەفس و هـزر و دەرمـانکردن و چارەسـەرە نەفسـیەکان هەیـە بەشـێوەیەك تـا ئـەو هەسـتی مرۆڤبوونـە زەوتکـراوە بگەڕێتـەوە بـۆ ئـەو مرۆڤانـە و سـەرلەنوێ رێـزی خۆیـان پـێ ببەخشرێتەوە، ئێسـتا ئـەو بەندانـەی فیرعـەون و هامـان و سـەربازەکانی ئەوانەی کە کاریان تەنها ئەوە بوو داواکاری فیرعەونەکان جێبەجێ بکـەن ئێسـتا وایـان لێهـاتووە ـ بەپشـتیوانی خـوا ـ ببنـە بەربەسـت بەرامبـەر ئەوانەی کە پێشتر دەیانچەوساندنەوە و سـتەمیان لـێ دەکـردن، ئێسـتا ئاسۆی ژیانێکی پاشایانە چاوەڕێ دەکەن پاش ئەو ژیانە ملکەچیە، ئەمە لەوانەیە وایان لێبکات بتوانن هەست بە گەورەیی یەکتاپەرستی بکـەن — ئەگـەر خـاوەنی کەسـایەتیەکی هاوسـەنگ بـن—، هـەروەها هەسـت بـەو جیاوازیە بکەن کە لەنێوان پەرستنی خواو پەرستنی فیرعەونەکاندا هەیە، ئەمەش لەوانەیە وایان لێبکـات زیـاتر دەسـتبگرن بـە یەکتاپەرسـتیەوە و پابەندبن بـە پەرستشـەکانەوە و راوەسـتاوترین لەسـەر دینـداری و زیـاتر

گــەورەیی ئــەوەی کــە پێغەمبــەرەکانیان بــۆی هێنــاون بــزانن، بــەڵام ئەزموونەکەیان لە کۆتاییدا سەریکێشا بەرەو دۆڕان، بەمەش وەك ئــەوەی بیســەلمێنن ئەگــەر کەســێك بەندەیــەکی وەك خــۆی ســتەمی لێ بکــات ئەستەمە ئەگەری چاکبوونی لێ بکرێت، لەگەڵ بوونی ئەو نۆ موعجیزەیەی کــە درابوویــە مووســا و ئــەو پێشکەشــکردنە لەڕادەبــەدەرەی کــە پێیــان بەخشرا لەلایەن خوای گەورەوە لە: سەرخستنیان و بارینی گەزۆو شەونم بۆیــان و هەڵقوڵانــدنی ئــاو بــەجۆرێك زۆر زیــاتر بــوو لــە پێویســتیەکانیان، هــەموو ئەمانــە نەبوویــە هــۆی پاككردنــەوەی یــەکجارەکی لــە چــەپەڵی بەندایەتیکردن بۆ مرۆڤ، وەك ئەوەی بەردەوام ئارەزوویــان بــۆی هــەبێت، گەزۆ و شەونم ئەو دوو خۆراکە پڕ چێژو خواردەمەنیە تــەواوەی کــە هــیچ ئــەرکێکیان پێــوە نەدەکێشــا نــەرمی نــەکردن، داوای ئــەو خۆراکــە کــەم بەهایانــەیان لــە مووســا دەکــرد کــە ئــالوودەی بووبــوون، تامــەزرۆی ئــەو خۆراکەیان دەکرد کە لە میسر دەیانخوارد ( پاقلە و سیر و پیاز و نیسك)، مووسا هیچی بۆ نەمایــەوە ئەوەنــەبێ پێیــان بڵــێ: (بچــنە میصــر ئــەوەی داواتان کرد لەوێ هەیە)، هەروەك ئەوەی پێیان بڵێت: ئەگەر ئارەزوومەند و تامەزرۆی خواردنی سەرشۆڕی و بێڕێزین ئەوا بگەڕێنەوە بۆ ئەو وڵاتەی کە سەرشۆڕی و سووکێتیتان تێدا چەشت، لەوێ ئەو خواردنەی نەفستان ئارەزوومەندێتی دەسگیرتان دەبێت! پوختەی قسەکان ئەوەیە پێویســتە لەسەر مرۆڤایەتی هەست بەو جێکەوتــە کاولکەریــەی ســتەم بکــات، نــابێ بوار بە دەرکەوتنی هیچ ستەمکار و بــە هــیچ رژێمێکــی ســتەمکار بــدرێت، بەڵام وادیارە مرۆڤ شتی بیردەچێتەوە.

## چوارەم: حوکمڕانی خوایی و کۆتا پەیام

یەکەم شتێك کە مرۆڤ تێبینی دەکات لە کۆتا پەیام بریتییە لە تێڕوانینی گەشبینانە بۆ مرۆڤ و جەختکردنی لەوەی کە گەشتۆتە ئەو ئاستەی بتوانێت ببێتە هەڵگری سپاردە و بەرپرسیارێتی و پابەندبوون بەو بەڵێنانەی کە لەنێوان خوای گەورە و باوکە ئادەم هەبوون و بەجێگەیاندنی یەکەمین ئەرکی مرۆڤایەتی ئاوەدانکردنەوەی گەردوون و جێنشینیکردن و هەڵگرتنی ئەرکی ئەمانەتە، خوای بالادەست ستایشی پێغەمەر ﷺ دەکات بەوەی هەڵگری پەیامی هەموو پێغەمبەرانی پێش خۆیەتی، هەڵگری راستاندن و زاڵبوون و لەخۆگرتن و تێپەڕاندنی ئاستەنگەکان، پاکسازی پەیامە ئاسمانیەکان بکات کە دەکرێت بەهۆی تەئویلکردنی نەفامەکان و دەستکاریکردنی ستەمکاران و تێکەڵکردنی شتی نامۆ لەلایەن پەڕگیرەکانەوە تووشی هاتبێت، با وردببینەوە لە هەندێك لەو ئایەتە پیرۆزانەی کە ئاماژە بۆ دەسەلات و حوکمڕانی دەکەن: ﴿إِنِ الْحُكْمُ إِلاَّ لِلّهِ يَقُصُّ الْحَقَّ وَهُوَ خَيْرُ الْفَاصِلِينَ﴾ (الأنعام: ٥٧) واتە: {فەرمانڕەوایی تەواو، هەر بەدەست خوای گەورەیە، ئەو لە ڕێگەی ئەم قورئانەوە حەقیقەت و ڕاستیەکان باس دەفەرموێت و دەیخاتە ڕوو، چونکە ئەو زاتە چاکترین و ڕاسترین جیاکەرەوەی ئیمان و شیرك، حەق و بەتاڵە}، وە﴿وَمَن لَّمْ يَحْكُم بِمَا أَنزَلَ اللّهُ فَأُوْلَئِكَ هُمُ الْفَاسِقُونَ﴾ (المائدة: ٤٧) واتە: {ئەوەی حوکم و داوەری نەکات بەوەی کە خوای گەورە ڕەوانەی کردووە و پابەندی نەبێت و پەیڕەوی نەکات، ئا ئەوانە کەسانێکی لەسنوور دەرچوو گوناهبارن}، ﴿وَمَا اخْتَلَفْتُمْ فِيهِ مِن شَيْءٍ فَحُكْمُهُ إِلَى اللَّهِ﴾ (الشورى: ١٠) واتە: {ئەی

باوەڕداران: ئێوە لە هەرشتێکدا کێشە و جیاوازیتان بۆ پێش هات ، ئەوە هەوڵ بدەن کە حوکم و فەرمانی خوا دەربارەی پەیدا بکەن و پیادەی بکەن}، وە هەروەها ﴿وَمَن لَّمْ يَحْكُم بِمَا أَنزَلَ اللّهُ فَأُوْلَـئِكَ هُمُ الْكَافِرُونَ ﴾ (المائدة: ٤٤) واتە: {ئەوەی حوکم بە شەرع و بەرنامەی خوا نەکات و بەرنامەی غەیری خوای لا پەسەند و چاك بێت، ئا ئەوانە لە ڕیزی بێباوەڕ و حەق پۆشاندان}، وە ﴿فَلاَ وَرَبِّكَ لاَ يُؤْمِنُونَ حَتَّىَ يُحَكِّمُوكَ فِيمَا شَجَرَ بَيْنَهُمْ ثُمَّ لاَ يَجِدُواْ فِي أَنفُسِهِمْ حَرَجًا مِّمَّا قَضَيْتَ وَيُسَلِّمُواْ تَسْلِيمًا﴾ (النساء: ٦٥)، واتە: {نەخێر، سوێند بە پەروەردگارت ئەو خەڵکە باوەڕی تەواویان نییە هەتا لە هەموو کێشەیەکدا کە ڕوو دەدات لە نێوانیاندا تۆ و شەریعەتی تۆ نەکەنە داوەر و گوێڕایەڵی نەکەن، دوای ئەوە بەهیچ جۆرێك نابێت هیچ ناڕەزایی و پێناخۆشبوونێك لە ناخیاندا هەبێت دەربارەی ئەو بڕیارەی کە تۆ داوتە، بەڵکو دەبێت بەتەواوەتی تەسلیم و ڕازی بن}، وە ﴿أَلَمْ تَرَ إِلَى الَّذِينَ أُوْتُواْ نَصِيبًا مِّنَ الْكِتَابِ يُدْعَوْنَ إِلَى كِتَابِ اللّهِ لِيَحْكُمَ بَيْنَهُمْ ثُمَّ يَتَوَلَّى فَرِيقٌ مِّنْهُمْ وَهُم مُّعْرِضُونَ﴾ (آل عمران: ٢٣) واتە: {ئایا سەرنجی ئەوانەت داوە کە بەشێك لەکتێبی ئاسمانییان پێدراوە لەکاتێکدا کە کێشەیەکیان بۆ دروست دەبێت داوا دەکەن کە کتێبێکی تر حوکم بکات لە نێوانیاندا، بەڵام پاش ئەوەی حوکمیش کرا بەو کتێبەی تر لە نێوانیاندا هەندێکیان ناقایل دەبن بەحوکمەکەو پشت هەڵدەکەن چونکە لەگەڵ هەواو حەزەکانیاندا ناگونجێت}، بەڵام بڕبڕەی پشتی پەیامی محمد ﷺ و ئەرکی سەرەکی کە لەسەر زمانی باوکی پێغەمبەران (ئیبراهیم) (سەلامی خوای لەسەر) بریتیە لە ﴿رَبَّنَا وَابْعَثْ فِيهِمْ رَسُولاً مِّنْهُمْ يَتْلُو عَلَيْهِمْ آيَاتِكَ وَيُعَلِّمُهُمُ الْكِتَابَ وَالْحِكْمَةَ

وَيُزَكِّيهِمْ إِنَّكَ أَنتَ العَزِيزُ الحَكِيمُ﴾ (البقرة: ١٢٩) واتـه: {پـەروەردگارا لـه نێـو ئەو خەڵكەی كە لە ئایندەدا نیشتەجێ دەبن پێغەمبەرێك رەوانە بكە كە ئایەتەكانی تۆیان بەسەردا بخوێنێتەوەو فێری كتێبی قورئان و داناییان بكات، دڵ و دەرونیان خاوێن بكاتەوەو پاك و پوختی بكات، چونكە تۆ بەڕاستی زاتێكی تەواو باڵادەست و تەواو زانایت (لە هەموو كار و بڕیارەكانتدا)}، پاشان خوای باڵادەست بە منەتەوە باسی دەكات و دەفەرموێت: ﴿لَقَدْ مَنَّ اللّهُ عَلَى الْمُؤمِنِينَ إِذْ بَعَثَ فِيهِمْ رَسُولاً مِّنْ أَنفُسِهِمْ يَتْلُو عَلَيْهِمْ آيَاتِهِ وَيُزَكِّيهِمْ وَيُعَلِّمُهُمُ الْكِتَابَ وَالْحِكْمَةَ وَإِن كَانُواْ مِن قَبْلُ لَفِي ضَلالٍ مُّبِينٍ﴾ (آل عمران: ١٦٤) واتـه: {لەڕاستیدا خوای گەورە منەتی خێری ناوەتە سەر ئیمانداران بەوەی كە پێغەمبەرێكی لە خۆیان بۆ ڕەوانە كردوون، كە بە ڕوونی و بە ئاشكرا ئایەتەكانی قورئانی پیرۆزیان بەسەردا دەخوێنێتەوە و هەوڵ دەدات ناخیان پاك و پوخت بكات و بەچاكی فێری قورئان و حیكمەت و داناییان بكات، هەرچەندە ئەوانە پێشتر لە تاریكی و گومڕاییەكی ئاشكرادا گیریان خواردبوو}، فەرمانیش دەكات بە پێغەمبەرەكەی كە ئەركەكەی كورت بكاتەوە: ﴿إِنَّمَا أُمِرْتُ أَنْ أَعْبُدَ رَبَّ هَذِهِ الْبَلْدَةِ الَّذِي حَرَّمَهَا وَلَهُ كُلُّ شَيْءٍ وَأُمِرْتُ أَنْ أَكُونَ مِنَ الْمُسْلِمِينَ * وَأَنْ أَتْلُوَ الْقُرْآنَ فَمَنِ اهْتَدَى فَإِنَّمَا يَهْتَدِي لِنَفْسِهِ وَمَن ضَلَّ فَقُلْ إِنَّمَا أَنَا مِنَ الْمُنذِرِينَ﴾ (النمل: ٩١ـ ٩٢) واتـه: {لەڕاستیدا منی پێغەمبەر فەرمانم پێدراوە كە پەروەردگاری ئەم ناوچەیە ببپەرستم كە سنووری بۆ داناوە و ڕێزی لێگرتووە هەندێ شتی حەڵاڵی تێدا حەرام كردووە، هەموو شتیش هەر بەدەست ئەو زاتەیە، وە من فەرمانم پێكراوە لە ڕیزی مسڵماناندا بم..،

هەروەها فەرمانم پێدراوە کە دەوری قورئان بکەمەوە، جا ئەوەی ڕێبازی هیدایەت و دینداری دەگرێتەبەر، ئەوە قازانجی هیدایەت و دینداریەکەی بۆ خۆیەتی، ئەوەش کە ڕێبازی گومڕایی دەگرێتەبەر ئەوە هەر خۆی زەرەر دەکات، هەردەم بەو جۆرە کەسانە ڕابگەیەنە کە کاری من بێدارکردنەوە و هۆشیاری دانە}.

ئەم ئایەتە پیرۆزانە ئاماژە دەکەن بۆ ئەو ئەرکە سەرەکیانەی کە خراونەتە ئەستۆی پێغەمبەر ﷺ، کە لە هیچکام لەو ئایەتانەدا ڕاشکاوانە باسی حوکم و حوکمڕانی نەکراوە بەو جۆرە مانایانەی کە دواتر بەکاردەهێنران، لەبەرامبەریشدا ئەو ئایەتانە دەبینین کە لەم دواییانەدا لێیانەوە چەمکی حوکمڕانی بەشێوەیەکی بەربڵاو پەرەی سەند، ئەوەی بیەوێت بەدواداچوون بکات بۆ ژیاننامەی پێغەمبەر ﷺ دەبینێت: پێغەمبەر سەرکردەیە، حاکمە، قازییە، موفتییە، فێرکارە، بەڵام ئەمانە هەمووی دەرهاویشتەی پێغەمبەرایەتییە، نەك دەرهاویشتەی دەسەڵات و حوکمڕانی، پێغەمبەرایەتی وەك مامۆستا، پێغەمبەرایەتی وەك پەروەرشیار، پێغەمبەرایەتی وەك کەسێکی هۆشیارکەرەوەی دەروون، نەك وەك شمشێری دەسەڵات و دەسەڵاتداران.

یەکێکی تر لەو کارانەی پێغەمبەر ﷺ کە جێگای لەسەر وەستانە، کاتی چوونی بۆ ڕزگارکردنی مەککە، فەرمانی کرد کە لەسەر لوتکەی شاخەکانی دەوروبەری مەککە ئاگر بکەنەوە پێش ئەوەی کە ڕۆژی دواتر بچێتە ناو شارەکە، بۆ ئەوەی قوڕەیش تووشی تێکشکانی دەروونی بکات و توانای بەرگرییان نەمێنێت، کاتێك ئەبو سوفیان بەهاوڕێیەتی عەباس

لەو شەوەدا و دەچوون بۆ لای پێغەمبەر ﷺ، بۆ ئەوەی موسڵمانبوونی خۆی راگەیەنێت پێش ئەوەی پێغەمبەر بچێتە ناو مەککەوە، بەڵکو لێیەوە پێغەمبەر ئاوڕێکی لێبداتەوە و شەرەفمەندی بکات بە یەکێك لە کارەکان، کاتێك ئەبو سوفیان بینی ئاگرێکی زۆر کراوەتەوە، پێشبینی زۆریی ژمارەی ئەو هاوەڵ و جەنگاوەرانەی کرد کە لەگەڵ پێغەمبەردان، بۆیە رووی کردە عەباس و وتی: دەسەڵاتی برازاکەت زۆر فراوان بووە، عەباسیش وەڵامیدایەوە و وتی: ئای ئەبو سوفیان ئەوە پێغەمبەرایەتیە[1].

لەم وتووێژەوە دەردەکەوێت کە ئەبو سوفیان دەسەڵات و پێغەمبەرایەتی تێکەڵ کردووە، بەڵام عەباس لای روونە ئەوە پێغەمبەرایەتیە و پێغەمبەرایەتی شتێکی جیاوازە لە دەسەڵات و دەسەڵاتداریێتی، پێغەمبەریش ﷺ ئەمەی لە فەرموودەکانیدا دووپاتکردووەتەوە، وەك ئەو فەرموودەی بۆ ئەو کەسەی کە لەبەردەمیدا دەلەرزی لە ترسی شکۆی پێغەمبەر، بۆیە فەرمووی پێی: (هێواشبەرەوە، من پاشا نیم، بەڵکو من کوڕی ئافرەتێکی قورەیشیم کە گۆشتی وشککراوەی دەخوارد) [2]، هەروەها ئەو فەرموودەیەی کە دەفەرمێ:

[1] ابن هشام، أبو محمد عبد الملك. السيرة النبوية، تحقيق: مصطفى السقا وابراهيم الأيباري وعبد الحفيظ شلبي، القاهرة: مكتبة ومطبعة مصطفى البابي الحلبي، ١٩٥٥م، ط٢، ج٢، ص٤٠٤.

[2] القزويني، أبو عبد الله محمد بن يزيد بن ماجة. السنن، تحقيق: شعيب الأرنؤوط ومحمد كامل قرەبللی، دمشق: دار الرسالة العالمية، ٢٠٠٩م، ط١، ابواب الأطعمة، باب القديد، ج٤، ص٤٣٠.

(خودایە بە مسکێنی زیندوومکەرەوە و بە مسکێنیش بمرێنە) [(١)]. هەموو ئەمانــە دەچــنە چوارچــێوەی هــەوڵی دورخســتنەوەی دەســەڵات و دەسەڵاتدارێتی و دووپاتکردنەوەی چەمکی پێغەمبەرێتی لە حوکمڕانیـدا، ئەمــە پێغەمبەرێتیــە وەســتاوە لەســەر خوێندنــەوەی قورئــانی پــیرۆز، خوێندنــەوەی ئایەتــەکان و فێربوونیــان و پــەروەردەکردنی خــەڵك و راســتکردنەوەی ئاکارەکانیـان بـەپێی ئـەو ئایەتانـە، تـا ئـەو ڕادەیـەی بەکارهێنانی ئەوەی هەژماردەکرێت بە هەڵسوکەوتی سیاسیانە، ئەوانەش هەر هەمووی لـە ڕوانگـەی پـەروەردەیی و فێرکردنـەوە دەکـران نـەك لـە ڕوانگەی دەسەڵاتخوازی، ئەمەش ئەو جیاوازییە بنەڕەتیەیـە کـە لـەنێوان

---

– الطبراني، ابو القاسم سليمان بن احمد. المعجم الاوسط، تحقيق: طـارق عـوض الله وعبـد المحسـن ابراهيم، قاهرة: دار الحرمين، ١٩٩٥م ط١، ج٢، ص٦٤.

– الخطيب البغدادي، أبوبكر أحمد بن علي. تأريخ بغداد، تحقيق: بشـار عـواد معـروف، بـيروت: دار الغرب الإسلامي، ٢٠٠١م ،ط١، ج٧، ص٣٦٣.

– الحاكم النيسابوری، أبو عبدالله محمد بن عبدالله. المستدرك علـى الصـحيحين، تحقيـق: مصـطفى عبد القادر عطا، بيروت: دار الكتب العلمية، ٢٠٠٢م، ط٢، ج٣، ص٧٠.

– الجرجاني، أبو أحمد بن عدي. الكامل في ضعفاء الرجال، تحقيق: عبد الفتاح أبو سنة، بيروت: دار الكتب العلمية، ٢٠٠٢ز، ط٢، ج٧، ص٥٤٥.

١ الترمذي، أبو عيسى محمد بن عيسى بن سورة. الجـامع الكـبير (سـنن الترمـذي)، تحقيـق: شـعيب الأرنؤوط و هيثم عبد الغفور. دمشق، دار الرسالة العالمية، ٢٠٠٩م، ط١، أبواب الزهد، بـاب (مـا جـاء أن فقراء المهاجرين يدخلون الجنة قبل أغنيائهم) ج٤، ص٣٧٥.

–القزويني، أبو عبد الله محمد بن يزيد بن ماجـه. السـنن، تحقيـق: شـعيب الارنـؤوط و محمـد كامـل قرەبللی، دیمەشق: دار الرسالة العالمية، ٢٠٠٩ز، ط١، أبـواب الزهـد، بـاب الجلـوس مـع المسـاكين، ج٥، ص ٢٤٠.

دەسەڵاتی پێغەمبەرایەتی و دەسـەڵاتداریێتی جگـە ئـەودا هەیـە، بۆیـە لـە فەرموودەدا هاتووە: (جێنشینی لە پاش من سی ساڵە) [1].

لـە(نوعمـانی کـوری بەشـیر)ە وە گێڕدراوەتـەوە دەفـەرمێ خـۆم لەگـەڵ باوکمدا (بەشیری کوڕی سەعید) لە مزگەوت بووین، ئەبو سەعلەبەی خوشـەنی هات باوکم پێـی وت: ئـەی بەشـیر، ئایـا ئـەو وتـارەی پێغەمبـەرت لەبـەرە کـە دەربارەی خەلیفەکانـە؟ ئـەویش وتـی: نـەخێر، حوزەیفـەی کـوڕی یـەمان کـە ئەویش لەوێ دانیشتبوو وتی: من لەبەرمە، ئەبو سەعلەبە لەگەڵیان دانیشـت و وتی بە حوزەیفە: پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ئەوەندەی خـوای گـەورە بیـەوێت پێغەمبەرایەتی لە ناوتاندا دەبێت، پاشان خوای بـەرز و بڵنـد هـەرکات ویسـتی هەڵیئەگرێت، پاش ئەوە دەبێتە جێنشین لەسەر ڕێبازی پێغەمبەرایەتی تا ئەو کاتەی خوای گەورە بیەوێت، پاشان ئەویش هەڵدەگیرێت هەرکات خوا ویسـتی لە هەڵگرتنی بێت، پاشان دەبێتە "پاشایەتی ستەم و ستەمکاری" ئەوەنـدەی خـوا بیـەوێت ئـەو پاشـایەتیە زۆرەملێیـە بـەردەوام دەبێـت، پاشـان هـەرکات ویسـتی پاشـایەتی هەڵـدەگرێت، پاشـان دەبێتـە جێنشـینی لەسـەر ڕێبـازی پێغەمبەرایـەتی، پاشـان بێـدەنگ بـوو. حـەبیب وتـی: لەوکاتـەدا سـەردەمی عومەری کوڕی عەبدولعەزیز بـوو، ئـیبن نوعمـان وتـی: مـن دەخـوازم عومـەری کوڕی عەبدولعەزیز ئەو جێنشـینە بێـت، وتـی: حـەبیب چـوو بـۆ لای عومـەری کـوڕی عەبدولعـەزیز و بـۆیْ گێڕایـەوە، ئـەویش پێـی سـەیر بـوو (ئەمـەی کـە

---

١البزار، أبوبكر أحمد بن عمر. البحر الزخار –المعروف بمسند البزار –تحقيق: محفـوظ الـرحمن زيـن الله، المدينة المنورة : مكتبة العلوم والحكم، ١٩٩٧م، ط١، أول مسند (سفينة مولى رسول الله رضي الله عنه)، ح ٣٨٢٨، ج٩، ص٢٨٠.

باسکرا)، ئەم فەرموودەیە نازانین کەسی تر وتبێتی: نوعمان لە حوزەیفەوە گێڕاویەتیەوە جگە ئیبراهیم کوڕی داوود نەبێت[1].

ئەمەی لەم کۆتاییەدا باسمان کرد، واتە پێویستبوونی دەرککردن بەوەی کە ئەرکی بنەڕەتی خەلیفە خوێندنەوەی ئایەتەکانی خوایە بەسەر خەڵکیدا و شارەزاکردنیانە لە قورئان و پاککردنەوەی دەروون، ئەو ئاراستەیەش کە وەستاوە لەسەر پاداشتکردنی چاکەکاران و سزادانی خراپەکاران هەر لەسەر هەمان ئاڕاستەی پاککردنەوەی دەروونەو چەندین شتی تریش کە ئەمانە هیچیان ناچنە خانەی خۆسەپاندن و زۆرەملێ و لەو چوارچێوەیەدا جێگای نابێتەوە، بەڵکو دەڕژێتە خانەی پاککردنەوەی دەروون و فێربوون و پەروەردەکردن، بە ڕوومالکردنی هەموو ئەمانە زەحمەتە بتوانین بەڕەهایی دان بنێین بە بوونی دەسەڵاتێکی خۆسەپێن لە ئیسلامدا کە وەستابێت لەسەر هەژموونی ڕەهای خوای بالادەست، یاخود پێغەمبەرەکەی بەناوی خواوە، یان جێنشینەکانی پێغەمبەر بەناوی خواوە، یان بەناوی شەرعەوە، بەڵکو بریتیە لە پەروەردە و پاککردنەوەی دەروون و خوێندنەوە و فێربوون.

بینا لەسەر ئەمە سەیری بارودۆخ و رووداو و پێشهاتەکانی تر دەکرێت بەو پێیەی هەر ئەم واتایە دووپات دەکاتەوە، فەرموودەکەی

[1] البزار، أبوبكر أحمد بن عمر. البحر الزخار –المعروف بمسند البزار –تحقيق: محفوظ الرحمن زين الله، المدينة المنورة : مكتبة العلوم والحكم، ١٩٩٧م، ط١، أول مسند مةسنةدى حذيفة رضي الله عنه، ج٧، ص٢٢٣

پێغەمبەریش کە پێشتر ئاماژەمان بۆ کرد[١] خوێندنەوەیەکی بۆ پاشەڕۆژ و تێڕوانینێکی دووربینانەی تێدایە لەلایەن پێغەمبەرەوە ﷺ بۆ ئەوەی پاش خۆی چی ڕوودەدات، پاشان چۆنیەتی تێگەیشتن لەم کارە بۆ کەسانی دوای خۆی، بەمەش پێغەمبەر ﷺ جیاکاریەکی گەورە دەکات لەنێوان جێنشینی لەسەر ڕێبازی پێغەمبەرایەتی و دەسەڵاتێکی زۆردار و خۆسەپێن لەژێر هەر ناوو دروشمێکدا بێت، کەواتە لە ئیسلامدا تەنها پێغەمبەرایەتی و جێنشینی لەسەر ڕێبازی پێغەمبەرایەتی هەیە.

بەڵام "حوکمڕانی" لەڕاستیدا دراوەتەوە دەست کتێبەکەی خوای باڵادەست "قورئانی پیرۆز" کە وەسفکراوە بە جۆرەها نازناو کە هیچ کتێبێکی تری پێش ئەم کتێبە بەو شێوەیە وەسف نەکراوە، ئەوەتا لەلایەن خوای باڵادەستەوە گرەنتی پاراستنی دەقەکانی دراوە، بەشێوەیەك بەردەوام بەپارێزراوی دەمێنێتەوە تا ڕۆژی قیامەت، بۆ هێنانەدی ئەم خواستە، قورئانی پیرۆز ئەو ڕاستیەی کە لە دووتوێیدایە دەسەلمێنێت، بەتوانا و ڕێزدارە، ئەو شەریعەتەی کە هەڵیگرتووە شەریعەتێکی ئاسانکار و پڕسۆزە و لابەری کۆت و بەندەکانە و زۆرێکی تر لەو تایبەتمەندییانەی کە وادەکات قورئانی پیرۆز ببێتە دەسەڵاتدار، بەڵام بە خوێندنەوەیەکی مرۆڤانە، مرۆڤەکانیشن کە هەمیشە دەخوێننەوە، لێرەوە گرنگی پرسی خوێندنەوە و مەنهەجی بوونی کۆکردنەوە لەنێوان

---

[١] **هەروەها بروانە** : ابن حنبل، أحمد . مسند الآمام أحمد بن حنبل، تحقيق: شعيب الآرنؤوگ وئاخرون، مؤسسه الرساله ، ١٩٩٩م، تتمه مسند المدنيين، حديپ النعمان بن بشير عن النبى ﷺ ، ج ٣٠ ح ١٨٤٠٦ص ٣٥٥.

هەردوو خوێندنەوەکەو پەیوەندییان بەم کارەوە بەدەردەکەوێت، بۆیە "حوکمڕانی خوایی" بۆ جوولەکەکان کۆتایی هات و چوویە لای پێغەمبەرانی جێنشین، پاشان چوویە لای پاشاکان لە نەوەکانی ئیسرائیل، ئەو سەردەمەش پێچرایەوە و کۆتایی هات.

بەڵام لە کۆتا پەیامدا بە پێغەمبەرایەتیەك دەستی پێکرد کە وەستابوو لەسەر پەروەردەو فێرکردن و پاککردنەوەی دەروون و خوێندنەوەی ئایەتەکان، تیایدا کرداری ئامادەسازی بۆ پێداویستیەکانی ئاوەدانکردنەوە و شارستانی بوون رەچاوکراوە، بەڵام بە دیدگای پێغەمبەرایەتی و جێنشینیەوە، تیایدا حوکمڕانی رادەستی کتێبەکەی خوای باڵادەست کراوە کە تاکە سەرچاوەی بەدەستهێنانی حوکمەکان و روونکەرەوەی هەموو شتەکانە. هەرشتێك تووشی هەرکەسێکی پەیوەست بە ئایینی خوای باڵادەست بووبێتەوە بەدڵنیاییەوە بەڵگەیەکی لە کتێبەکەی خوای گەورەدا دەست دەکەوێت بۆ رێنیشاندانی، خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿الَر كِتَابٌ أَنزَلْنَاهُ إِلَيْكَ لِتُخْرِجَ النَّاسَ مِنَ الظُّلُمَاتِ إِلَى النُّورِ بِإِذْنِ رَبِّهِمْ إِلَى صِرَاطِ الْعَزِيزِ الْحَمِيدِ﴾ (ابراهيم: ١) واتە: {ئەم قورئانە لەو پیتانە پێکهاتووە و نازڵمان کردووە بۆ تۆ ئەی پێغەمبەر ﷺ، تا خەڵکی بە هۆیەوە لە تاریکیەکانی (بێ دینی و نەفامی و نەزانی و ستەم) دەرباز بکەیت و بیانخەیتە دەریای نوور و بەرچاوڕوونیەوە بە ویستی پەروەردگاریان، تا بە تەواوی تێبگەن لە بەرنامە و ڕێبازی خواوەندی باڵادەست و شایستەی سوپاسگوزاریی}، هەروەها دەفەرموێت: ﴿بِالْبَيِّنَاتِ وَالزُّبُرِ وَأَنزَلْنَا إِلَيْكَ الذِّكْرَ لِتُبَيِّنَ لِلنَّاسِ مَا نُزِّلَ إِلَيْهِمْ وَلَعَلَّهُمْ

يَتَفَكَّرُونَ﴾ (النحل: ٤٤) واتە: {ئەوەتە هەر ئێمە ئەم قورئانەشمان بۆ تـۆ نازڵ کردووە تا پەیامی خوا بە جوانی ڕابگەیەنیت و ئـەم پەیامـە بـۆ ئـەو خەڵکە ڕوون بکەیتەوە کە لە لایەن پەروەردگاریانەوە بۆیان نازڵ کـراوە، بەڵکو بیر بکەنەوە و تێفکـرن }، وە دەفـەرموێت: ﴿وَنَزَّلْنَـا عَلَيْـكَ الْكِتَـابَ تِبْيَانًا لِّكُلِّ شَـيْءٍ وَهُـدًى وَرَحْمَـةً وَبُشْـرَى لِلْمُسْـلِمِينَ﴾ (النحـل: ٨٩) واتـە: {هەروەها ئەم قورئانەشمان بۆ نازڵ کردویت کە هەموو شتێکی پێویستی دەربارەی دنیا و قیامەت تێدا ڕوونکراوەتەوە، هەروەها هیدایەت و میهر و ڕەحمــەت و مژدەبەخشیشــە بــە مســوڵمانان لــە ســەرجەم زەمــان و زەمینێکدا}، هەروەها دەفەرموێت: ﴿وَكَذَلِكَ أَوْحَيْنَا إِلَيْكَ رُوحًا مِّنْ أَمْرِنَا مَا كُنتَ تَدْرِي مَا الْكِتَابُ وَلَا الْإِيمَانُ وَلَكِن جَعَلْنَاهُ نُورًا نَّهْدِي بِهِ مَنْ نَّشَـاء مِـنْ عِبَادِنَا وَإِنَّكَ لَتَهْدِي إِلَى صِرَاطٍ مُّسْتَقِيمٍ﴾ (الشورى: ٥٢). واتە: {ئەی محمد ﷺ ئا بەو شێوەیەی کە دەیزانیت ئێمە ڕۆح و قورئانێکمان بـە وەحـی و نیگا بۆ ڕەوانە کردیت بە مەرجێك تـۆ پێشـتر نەتـدەزانی قورئـان چـیە و ئیمان چۆنە، بەڵام ئێمە ئەوەتە قورئانمان کردووە بە سەرچاوەیەکی نـور و ڕوناکی و هیدایەتی ئەو بەندانەی کە شایستەن بێگومان تۆ چاوسـاغ و ڕێنمونی ئـەو خەڵکـە دەکـەیت بـۆ بەرنامـە و ڕێگـە و ڕێبـازێکی ڕاسـت و دروست}.

کەواتە حوکمڕان ئەو کتێبەیە کـە خـوای باڵادەسـت ناردویەتیـە سـەر مرۆڤە جێنشینەکان –سەربە هەر شارستانیەتێك بێت، یان هەر شێوازێکی ڕۆشـنبیری و هــەر بـوارێکی مــەعریفیی هــەبێت – تـا ئـەو راسـپاردە و

ڕێنماییانەی کە تیایدایە جێبەجێ بکرێت و ڕاستی سەرکەوێت و ببێتە نێوەندگیر لەنێوان خەڵکدا.

لە حوکمڕانی ئەم کتێبە پیرۆزەدا مرۆڤەکان بەرپرسن بەرامبەر هەر شتێك کە پێویست بێت بۆ بەها گشتییە هاوبەشەکانی نێوان مرۆڤەکان، بەهاکانی دادپەروەری و دەستپاکی و ڕێنماییکردن، بۆیە پێویستە مرۆڤەکان ئەم قورئانە بخوێننەوە، خوێندنەوەیەکی مەنهەجیانە، خوێندنەوەکە هاوکات بێت لەگەڵ خوێندنەوەی گەردووندا و هەردووکیان لە پرۆگرامێکدا کۆبکاتەوە لەیەك خوێندنەوەی مۆڵ و دانەبڕاو لەیەکتر، هەر لەو کاتەی کە هەڵدەستێت بە خوێندنەوە و ڕۆچوون لە نێو ئایەتەکان و بیرکردنەوە لێیان هەڵدەسێت بە تێبینی و بەدواداچوون و بیرکردنەوە و لێوردبوونەوە لە سوننەتەکانی گەردوون، ژیری و هزریش هەڵدەسێت بە کۆکردنەوەی ئەوەی کە لەو نێوەندەدا دەستی دەکەوێت لەو دوو سەرچاوەیە (سرووشە خوێندراوەکە "قورئان" و گەردوونی پەخشکراو)، تێکهەڵکێشکردنی هەردووکیان، لێیانەوە بەشێوەیەکی ڕێکوپێك دەرەنجامێك دەدات بەدەستەوە، دەرەنجامەکەش دەبێتە تەواوکاری ئەو یاسایانەی کە ژیان ڕێکدەخات و ئەو بناغە مەنهەجیانەی کە دەکرێت مرۆڤەکان بە هۆیانەوە ڕێگای دروست بدۆزنەوە و ڕزگاریان ببێت لە خولگە دژبەیەکەکان و دوانەیی ڕکابەر کە لەو خوێندنەوە تاکلایەنانەوە سەرچاوە دەگرێت، خوێندنەوە ناکامەکان وای لێدەکات وردوخاش ببێت لەنێو ئەو دوانەییەدا، کە وادەکات لە مرۆڤایەتی کاتێکی زیاتر لەژیانی خۆی بەفیڕۆ بدات لەنێوان ئەو بۆچوونە دژبەیەکانەدا،

بۆچوونی جەبری و قەدەریەکان، بۆچـوونی تێکـەڵکردن لـەنێوان کـرداری مرۆڤایەتی و کرداری خوایەتی و چەندین بۆچوونی تر و لەنێوان بۆچوون و دەربـارەی حـوکمڕانیکردنی کتێبەکـەی خـوا، ئـەم حوکمڕانیـە چـەندین رەهەنـد پاڵپشـت و بـەهێزی دەکـات، لەوانـە: گشـتییبوونی شـەریعەت، گشتگیری و دەرچوون لەوەی کە تەنها دەقێکی قورئانی پارێزرا و بێـت و تاقمێك لە خەڵك هەستن بـە لەبـەرکردنی و زۆرینـەی خەڵکەکـەی تـر لێـی بێئاگابن، بـەڵکو ئەمـە کتێبێکـی کـراوەی ئاشـکراکراوە، هـەموو کەسـێك دەتوانێت بیخوێنێتەوە و پەیوەندی پێوە بکات، بەشێوەیەك هیچ تاقمێك ناتوانێت خۆی بکاتە دەمڕاست و لـەڕێی بانگەشـەی کـارکردن بـەحوکمی خوایی و خۆسـەپاندن بەسـەر خەڵکیـدا، لەبـەر هـیچ شـتێك نـا تـەنها بـە بەبیانووی ئەوەی هەر ئـەوان زیـاتر شـارەزا و تایبەتمەنـدن و لـە توانـای کەسانی تردا نییە بگەن بە ئەو ئاستە.

بەهەمانشـێوە حـوکمکردنی قورئـان، مرڕۆڤـەکان ئـازاد دەکـات، دەریدەهێنێت لەژێر چەپۆکی هەر کەسێکی خۆسەپێن لەژێر نـاوی "مـافی خودایی" — هەروەك ئەو حاڵەتـە لـە زۆرێـك لـە شارسـتانیەتەکانی کۆنـدا هەبوو—، توانایـەکی بـەردەوامیش دەداتـە مرۆڤـەکان بـۆ تازەکردنـەوەی حوکمـەکان لەڕێگـەی کـارکردنی نـەوە خوێنـدەوارەکان لەگـەڵ قورئـانی پیرۆزدا و ڕێکخستنی ژیان لەسەر شێوازێکی نەرم و فراوان لەچوارچـێوەی ئـەو بـەها قورئانیـە رەهایانـەی کـە توانـای هەیـە هـەر واقیعێکـی مرۆیـی لـەخۆبگرێت، ئـیتر ئـەو واقیعـە هەرچـۆنێك بێـت و بـە تێگەیشـتنێکی مرۆڤانـەی تازەگـەر کـە مـافی خۆیـەتی جیـاواز بێـت لـە شـوێنێکەوە بـۆ

شـوێنێکی تـرو لـە کاتێـك بـۆ کـاتێکی تـر، سـوودوەرگرتن لـە هــەموو حاڵەتەکان لە هەموو ئەزموون و لێهاتنەکان، لە مەنهەجیەتی پێغەمبـەری خوا ﷺ و تێگەیشـتنی بـۆ قورئـانی پـیرۆز و پەیوەسـتکردنی بـەهاکانی لەگەڵ واقیعدا، هەموو ئەم بەخششانە و هەموو ئەم بایەخانە ئەوانەن کـە خوای گەورەو باڵادەسـت لـە قورئانـە پیرۆزەکەیـدا ئامـاژەی پێکـردوون: ﴿وَاكْتُبْ لَنَا فِي هَذِهِ الدُّنْيَا حَسَنَةً وَفِـي الآخِـرَةِ إِنَّـا هُـدْنَا إِلَيْـكَ قَـالَ عَـذَابِي أُصِيبُ بِهِ مَـنْ أَشَـاء وَرَحْمَتِـي وَسِـعَتْ كُـلَّ شَـيْءٍ فَسَـأَكْتُبُهَا لِلَّـذِينَ يَتَّقُـونَ وَيُؤْتُونَ الزَّكَاةَ وَالَّذِينَ هُم بِآيَاتِنَـا يُؤْمِنُـونَ * الَّـذِينَ يَتَّبِعُـونَ الرَّسُـولَ النَّبِـيَّ الأُمِّيَّ الَّذِي يَجِدُونَهُ مَكْتُوبًا عِندَهُمْ فِي التَّـوْرَاةِ وَالإِنْجِيـلِ يَـأْمُرُهُم بِـالْمَعْرُوفِ وَيَنْهَاهُمْ عَنِ الْمُنكَرِ وَيُحِلُّ لَهُمُ الطَّيِّبَاتِ وَيُحَـرِّمُ عَلَـيْهِمُ الْخَبَآئِـثَ وَيَضَـعُ عَـنْهُمْ إِصْرَهُمْ وَالأَغْلاَلَ الَّتِي كَانَتْ عَلَيْهِمْ فَالَّذِينَ آمَنُواْ بِهِ وَعَزَّرُوهُ وَنَصَرُوهُ وَاتَّبَعُواْ النُّورَ الَّذِيَ أُنزِلَ مَعَهُ أُوْلَئِـكَ هُـمُ الْمُفْلِحُـونَ﴾ (الاعـراف: ١٥٦ــ ١٥٧) واتـە: {خوایە گیان! داواکارین لە زاتی خـاوەن میهرتـان کـە لـە دنیـادا خێـر و چاکەمان بۆ پێش بهێنن، هەروەها لـە قیامەتیشـدا خێـر و چـاکەمان پـێ ببەخشـیت، لـە ڕاسـتیدا ئـیتر ئێمـە بـە تـەواوەتی ڕێنمـویی کـراوین بـۆ پەرستنی تەنها زاتی تۆ، خوای گەورەش لە وەڵامیاندا فەرموی: من سزا و تۆڵـەی خـۆم بەسـەر کەسـێکدا دەدەم کـە خـۆم دەمـەوێت و (ئـەویش شایسـتەیە)، بـەڵام ڕەحمـەت و سـۆز و میهرەبـانیم هـەموو شـتێکی گرتۆتەوە، تۆماریشی دەکەم بۆ ئەو کەسانەی کـە تـەقوادار و دینـدارن و خۆیان دەپارێزن لـەو شـتانەی کـە مـن قەدەغـەم کـردووە، ئەوانـەی کـە زەکاتی ماڵ و سامان و هەرچی شتێك کە هەیانە دەیبەخشـن، بـە هـەموو

بـوارێکی خێـر و چـاکە، ئەوانـەی کـە باوەڕیـان بـە هـەموو ئایـەت و فەرمانەکانی ئێمە هەیە، هەروەها ئەوانەی کە لە ئاینـدەدا بـاوەڕ دەکـەن بـە پێغەمبـەر و فرسـتادەی نەخوێنـدەوارمان (محمـد ﷺ)، جوولەکـە و مەسـیحیەکانیش ناونیشـانەکانی دەبیـنن کـە تۆمـار کـراوە لـە تـەورات و ئینجیلـدا (لەگـەڵ دەستکاریکردنیشـیدا) کـە هەنـدێ سـیفاتی ئەوەیـە: فەرمانیان پێدەدات بە چاکە و چاکەکاری، هەرچی شتێکی چاك و پـاك و بەسودە بۆیان حەڵاڵ دەکات، هەرچی شتێکی پـیس و خـراپ و ناپوختـە لێیان حەرام دەکات، ئەرکە قورس و سەنگینەکان لەسەرشانیان لادەبات، ئەو کۆت و زنجیرانەش کە لە گەردنیاندا بوو (بەهۆی لادان و یـاخیبوون و گوناهەکانیانەوە، وەکو خۆکوشـتن بـۆ ئـەوەی تەوبـەیان گـیرا بێـت) لای دەبات، جا ئەوانەی باوەڕی پێ دەکەن و پشـتیوانی ئـاین و بەرنامەکـەی دەکەن و شوێنی ئەو نوورە دەکەون (کە قورئانە) و بۆ ئەو نـازڵ کـراوە، هەر هەموو ئەوانە سەرفراز و ڕزگار و سەرکەوتوون لە هەردوو جیهاندا﴾.

کەواتە قورئانی گـەورە دەسـەڵاتداری ئـەم گەلەیـە کـە خـوای گـەورە ویستویەتی گەلێکی نێوەندگیر بێت، هەرئـەویش خـاوەنی دەسـەڵاتە لـەم کۆتا پەیامـەدا کـە خـوای گـەورە ویسـتویەتی پـەیامێکی جیهـانی بێـت و تەواوی مرۆڤەکان لەژێریدا بحەسێنەوە، لێرەدا دەمانـەوێت ئـەم وتەیـەی پێشەوا (شاطبی) نەقلٚ بکەین: "شەریعەت – کە مەبەسـت لێـی قورئـانی پیرۆزە –هەر خۆی بەڕەهایی حوکمڕانە بەسەر هەموانەوە، واتە: بەسـەر پێغەمبەر و تەواوی بەندەکانەوە کە قورئانی پیرۆز خۆی ڕێنیشـاندەرە و هـەر خـۆی سرووشـی دابـەزێنراوە بـۆ سـەر پێغەمبـەر و ڕێنماییکـار و

روونکەرەوەیـــە بـــۆ ئـــەو هیدایەتـــە و دروســـتکراوەکانیش هـــەموو ڕێنیشاندراون"[1]، کاتێکیش دڵی پێغەمبەر ﷺ و هەموو پارچـەکانی لەشـی و رووکاری ناوەوەو دەرەوەی بەو نووره راستەقینەیە رووناك بوویەوە بە زانسـت و بە کردار، ئەو بوویە ڕێنیشاندەری یەکەمین و گەورەترین رابەر بۆ ئەم گەلـە، ئەوەتا خوای گەورە تایبەتی کردووە بـە دابەزانـدنی ئـەو نـووره ئاشـکرایە بـۆ سەری لەکاتێکدا هیچ دروستکراوێکی تری بۆ تایبەت نەکردووە، ئەوی هەڵبژارد لەنێو ئەو کۆمەڵە خەڵکەی کە وەك ئەو وابوون لە شێوازی دروستبوونیاندا وەك هـەر مرۆڤێکـی تـر، ئـەوی هەڵبـژارد یەکـەمجار لـە رووی تایبەتمەنـدبوونی بـە سرووشـەوە کـە بەهۆیـەوە دڵ و ئەندامـەکانی لەشـی پـێ روونـاك کـردەوە تـا ئاکارو رەوشتی بوویە قورئان، ئەمەش دەرەنجامی ئـەوەبوو سرووشـی کـردە حوکمڕان بەسەر خۆیەوە تا رەوشت و هەڵسوکەوتی وەك ئـەوی لێهـات، واتـە بەگوێرەی سرووش و هەروەها بەگوێرەی قورئانی پیرۆز، قورئان دادەبەزی بـۆ هـەموو هەڵوێسـت و حاڵـەتێك بـە قسەلەسـەرکردن یـان بـە روونکردنـەوە و دیاریکردنی سزا یان پاداشت، پێغەمبەریش ﷺ شوێنکەوتە و وەڵامدەرەوەی داواکانی بوو، لەئاست حوکمەکانیـدا دەوەسـتا، ئەگـەر ئـەو ئاوابووبێـت، واتـە شەریعەت حوکمی پێغەمبـەری ﷺ کردبێـت، یـاخود قورئـانی پـیرۆز حـوکمی کردبێت بەسەریدا، کەواتە لەپێشترە بۆ ئەوەی هەموو خەڵك شـەریعەت ببێتـە حوکمڕان و بەڵگە لەسەریان. (شاطبي)یش –رەحمەتی خوای لێبێـت– لێـرەدا شـەریعەتی بـە هاومانـای قورئـانی پـیرۆز بـەکارهێناوە بەهەمانشـێوە لـەو چوارچێوەیەشدا وشەی تەورات لەبری شەریعەت بەکاردەهێنرا.

---

[1] الشاطبي، ابراهيم بن موسى، الاعتصام، تحقيق: هشام بن إسماعيل الصيني، بيروت: دار الجـوزي، ط١، ٢٠٠٨م، ج٣، ص٣٠٩.

## پێنجەم: حوکمڕانی بەو مانایەی چەمکێکی وروژێنەرە

هەرچۆن ئەو چەمك و گۆڕانکارییانە بەدەرکەوتن لەلایەن گرووپــەکانی کاری ئیسلامی کە لەم دواییانەدا لە زۆرێك لە وڵاتـانی جیهـان، دەسـتیان کرد بە بەرزکردنەوەی دروشمی "حوکمڕانی خوایی- الحاکمیة الإلهیـة-" و بەو ناوەوە هەنگاویان دەنا بۆ گرتنەدەستی دەسەڵات و جەختیان لەوە دەکردەوە کە ئیسلام لەسەر ئەم بۆچوونە دامەزراوە، یاخود پابەندە بەم ئاڕاستەیەوە؟!

ئەم بزاوتە ئیسلامیە هاوچەرخانە بریتین لـە درێـژکراوەی هـەمان ئـەو بزاوتە شۆڕشگێڕ و جیهادیانەی پێشووتر، ئەو بزاوتانەی کە پێشـەوایەتی کارنامـــەی ئـــازادکردنی چـــەندین هـــەرێمی گـــەلانی جۆراوجـــۆری موسڵماننشینیان کرد لە بێباوەڕانی داگیرکار و ئەو دوژمنکاریانـەی کرایـە سەریان، ئەو بزاوتانە هەموو وزە و هێز و تواناکانی گەلیان بەکاردەهێنا و سوودیان وەردەگرت لە گشت کەلـەپوورە فیکـری و ڕۆشـنبیرییەکان بـۆ هاندانی ئەم گەلە بۆ تێکۆشـان و ڕووبەڕووبوونـەوە، لەهەمانکاتـدا تـوانی ریزەکـانی یـەکبخات تـا بتوانێـت سـەرکەوێت بەسـەر دوژمنەکانیـدا و خاکەکەی رزگار بکات و سەروەری و سەربەزی بگەڕێنێتەوە بۆ گەلەکەی، تا شوێنی شیاوی خۆی لە ناوەندەکاندا بەدەست بهێنێتەوە.

لەڕاسـتیدا گـەل سـەرکەوتنی بەدەسـتهێنا لـەوەدەرنانی بێبـاوەڕانی داگیرکار و دەموچاوەکان گۆڕان و حکومەتەکان دامەزران کە ناسـرابوون بـە حکومـەتی نیشـتمانی، سـەربەخۆیی بـۆ هـەمووان یـان زۆرینـەی ئـەو

ولاّتانـەی کـە لـەژێر دەسـتی داگیرکـاردا بـوون هاتـەدی، سـەربەخۆییش شێوازی جۆراوجۆری هەبوو، سروشتی پەیوەندییەکان لەنێوان ئەو ولاّتانە و جگە ئەو ولاّتانەش گۆڕانکاریی بەسەردا هات، بەلاّم گرووپـەکانی کـاری ئیسـلامی کـە بـە درێـژکراوەی ئـەو بزاوتـە پێشـەنگ و سەرمەشـقانە دەژمێردرێت کە زۆرێك لە توانای پێشکەش کرد و قوربانیەکی زۆری دا لە رێگای گەیشتن بە رزگاربوون، لەناکاو بۆیدەرکەوت هـەموو ئـەو ئامـانج و دروشمانـەی کـە لـە کـاری وروژانـدنی گـەل و گەڕاندنـەوەی کـارایی و کۆکردنـەوە و یەکخسـتنی وزەکـان لـەپێناو رزگاربوونـدا بـەکاری دەهێنـا بێئاکـام کـرا، یـاخود بـەو شـێوەیەی کـە ئاواتیـانبوو بۆیـان بێتـەدی بەدینـەهات، بۆیـە بێهیوابـوون وایلێکـرد دەسـت بکاتـەوە بـە جیهـاد و تێکۆشان بەشێوازی جۆراوجۆر، لەبەر هۆکارو بارودۆخێك کـە هەنـدێکیان مێـژوویین و پەیوەنـدی بـە میراتگـیری دەسـەلاّت و حوکمـەوە هەیـە و هەندێکی تریشی دەرهاویشتەی هاوچەرخبوونە و پەیوەنـدیی بـە مـاوەی داگیرکـاری و هــەژموونی دیـدی خۆرئاواییەکانـەوە هەیـە بـۆ دەوڵـەت و حوکمڕانی و دەسەلاّت و هێز، بۆیە هەندێك دیدی تایبەتی زاڵ هەبوون بـۆ چەمکی دەوڵەت و نەتەوە، یان هەرێم و چەمکی دەسەلاّت، لەڕاستیدا ئەو چەمك و عەقلاّنە سەرلەنوێ داڕێژرانەوە دوور لە کاریگەرییە فیکرییەکانی دیدی ئیسلامی و راگر و تایبەتمەندییە راستەقینەکانی.

لەم چوارچێوەیەدا بزاوتە ئیسلامیە هاوچەرخەکان لەناوەوە دەستیان کردەوە بە تێکۆشان و بەرخۆدان، وەك هەوڵدانێك بۆ بەدەستهێنانی ئـەو ئامانجانەی کە باوباپیران لە پێناویدا شەهیدبوون، ئیتر لە جـەزائیر بێـت،

یان له میسر، یان له هیندستان، یان له عێـراق، یـاخود لـه هـەر وڵاتێکـی تری ئیسلامی، ئەم بزاوتانه بۆیان دەرکەوت خواست و ئامانجەکانی گـەل شکستی پێهێنراوە، بەڵام ئەمجارەیان لەسەر دەستی کەسانێك که نەوەی ئەم وڵاتەن، بۆیه دەبێـت سـەرلەنوێ هـەوڵی گەڕاندنـەوەی رۆڵ بـۆ گـەل بگێڕدرێتەوە و جارێکی تر ریزەکانی رێکبخرێتەوە بۆ نۆرەیەکی تـازەتری تێکۆشان و بەرخۆدان، بۆ بەدەستهێنانی ئامانجـه سـەرەکییەکانی گـەل، که مەبەست لێی بەدەستهێنانی یەکێتی گەل و ئازادبوونی و بـەجێهێنانی سەربەخۆیی رۆشنبیریی و یاسایی و چـەندین شـتی تـریش، ئـەو بزاوتانـه پەنایان بـرد بـۆ سـوودوەرگرتن لـەو سـەرمایه فیکریـی و رۆشـنبیرییانەی بزاوتــه ئیســلامیەکانی پــێش خۆیــان و بــەکارهێنانیان لــه زۆر کاروبــاری جۆراوجـۆردا، کـه هەنـدێکیان مەبەسـت لێـی وروژانـدن و گەڕاندنــەوەی کاریگەرییــه، هەنـدێکی تریشـیان مەبەسـت لێـی دۆزینــەوەی ئــەو هێــزە کاریگەرەیه که توانای هەبێت بـۆ گۆڕانکـاری بـه ئاڕاسـتەی ئـەو ئامانجـه گەورانەی که هەندێکی کەمی نەبێت بەدەسـت نـەهاتووە، چـونکه رژێمـه میراتگرەکان کەسانێك کاربەدەستبوون تیایـدا نـەوەی وڵاتـانی موسـڵمان بوون و بەهەمان زمان دەئاخاوتن و خۆیان به ئەندامی ئەو گەلـه دادەنـا، بـەڵام هـەموو ئـەو ئامانجانـەیان گۆڕیـەوە بـه ئامانجگـەلێکی تـازەتر کـه مەبەست لێی زیاتر لکان و ئاوێتەبوون بوو لەگەڵ ئەوانـەی کـه نـەوەکانی پێش ئەمان تێکۆشانێکی زۆریان کرد تـا لـه چـەپۆکیان رزگاریـان ببێـت، بەڵام ئەمان بوونه شوێنکەوتەیان لەبواری ئابووریدا، بوونه شوێنکەوتەیان لـه بـواری رۆشـنبیری و فیکـری و دامـەزراوە و سیسـتەمدا، لـه ژێـر ئـەم

بارودۆخـــەدا بـــانگخوازان هەوڵیانـــدا هـــەموو چـــەکێکی وروژێنـــەر و پشتپێبەستراو بخەنەگەڕ، یەکێك لەوانە کە خرایە گەڕ ئەو دەسەڵاتەی کە ئێستا هەیە و بووەتە میراتگر، هەرچەندە نازناوی ئیسلامیی هەڵگرتووە و لـە ڕواڵەتیشـدا وابەسـتەیە بـە هەرێمـە موسڵماننشـیینەکانەوە، ئەمانـە رژێمگەلێکی جاهیلی و دەسەڵاتخواز و نەشیاون، لەبنەڕەتیشدا دەسـەڵات دەبێت دەسـەڵاتی خـوایی بێـت، لەگـەڵ ئەوەشـدا ئـەو دەسـتەو گرووپـە ئیسلامیانە نەیانتوانی بڵـێن ئـەم رژێمانـە دەسـەڵاتیان زەوتکـردووە، کـە ئـەمان لەپێشـتربوون پێـی، یـان دەسـەڵات مـافی ئەمانـە، لەبـەر ئـەوە ناچاربوون رێگاچارەیەك یان شتێك بکەن کە بتوانن خەڵکەکە بەرەو ئەوە ئاڕاسـتە بکـەن و پەیوەسـتی بکـەن بـە باوەڕیـان و ئاسـتی زانیـاری و لێهاتووییانـــەوە، ئـــەوەبوو بۆچـــوونی وەك "جاهیلیـــەت و حـــوکمڕانی" دەوروژێنرا، کە کاریگەرترین هۆکار بـوو کـە دەکـرا پـەنای بـۆ ببرێـت بـۆ بەجێگەیاندنی ئەو کارە.

سەرەتا ئەم حاڵەتە لە پاکستانەوە دەستی پێکرد، کە بە نموونەیەکی باش دادەنرێت بۆ لێکۆڵینەوە لەم بوارەدا، چونکە یەکەم شوێنە کـە ئـەم بۆچـوونانەی تێـدا بەدەرکـەوت، واتـە بۆچـوون دەربـارەی چـەمکی "جاهلیـــەت" و "حـــوکمڕانی" لەســـەر زاری ســـەرکردە ئیســـلامیەکان، بەتایبـەت لەلایـەن "ئـەبو ئـەعلای مـەودودی"، چـونکە لـەو سـەردەمەدا پاکسـتان بەشـێك بـوو لـە هیندسـتانی گـەورە، موسـڵمانەکانیش وەك دەسەڵاتدار و گەورەی هیندستان بۆ ماوەی دوو سەدە تیایدا دەژیـان تـا ئەو کاتەی هێرشی بەریتانیا هات و کردنیە کەمینەیەکی دەربەدەربوون و

دەیاننالاندا بەدەست چەندەها شێوازی چەوساندنەوەی ئایینی و رەگەزی و زۆر شتی تریش، بۆیە سەرکردە ئیسلامیەکانی ئەو کاتە ناچاربوون بانگەشە بۆ دەوڵەتێکی سەربەخۆ بکەن لە هیندستان، ئەوە بوو پاکستان لەدایك بوو لەچوارچێوەی تێڕوانینی دامەزراندنی دەوڵەتێکی موسڵمان کە پارێزگاری لە موسڵمانەکان بکات و، ئازادییان بۆ بگێڕێتەوە و بتوانن بە ئارامی ژیان بەسەربەرن لە دەوڵەتێکی ئیسلامی سەربەخۆدا، سەرەنجام ئەو دەوڵەتە بە قوربانیدانێکی زۆر دروست بوو، لە سەرەتادا موسڵمانەکان لەگەڵ هیندیەکانی تردا قوربانییاندا بۆ رزگارگردنی هیندستان لەدەست داگیرکار، پاشان کاتێك موسڵمانەکان خواستەکانیان لە سەربەخۆییدا نەهاتەدی، جارێکی تر هەوڵیاندا خۆیان لە دەسەڵاتی نیشتمانی کە لە هیندستاندا دامەزرا رزگار بکەن و دەوڵەتێکی تایبەت بەخۆیان دامەزرێنن، هیواخوازبوون ئەم دەوڵەتە ئیسلامی و شەرعی بێت و هەموو راگرە شەرعیەکانی تێدا بەرجەستەبێت لەچوارچێوەی ئیسلامدا، ئەوەبوو دەوڵەت دامەزرا، جیاوازیەکی ئەوتۆی نەبوو لەگەڵ دەوڵەتەکانی تردا، دەوڵەتێك دەیویست هەنگاو بنێت بەرەو گرتنەبەری رێچکەی نەتەوەیی لەچوارچێوەی زاڵبوونی چەمکە رۆژئاواییە هاوچەرخەکەدا، وردە وردە ئەو بەڵێنانەی کە دابووی بە خەڵك لێیان پاشگەزبوویەوە، سەرکردەکانی کاری ئیسلامی هەستیان بە جۆرێك لە خەڵەتان دەکرد، بۆیە دەستیان کردەوە بە کارکردن بۆ شۆڕشی سێیەم لەپێناو گەیشتن بەو دەوڵەتەی کە لەچوارچێوەی ئەو ململانێ و تێکۆشان و بەرخۆدانەیاندا خەونیان بە دامەزراندنیەوە دەبینی، لە بواری

چاککردنەوەی بارودۆخەکەیش چەمکی "جاهلیەت و حوکمڕانی خوایی" خرانەڕوو لە ناوەندە ئیسلامیەکەدا.

سەید قوتب نوێنەرایەتی چۆنیەتی هەڵسوکەوتی لەگەڵ چەمکی حوکمڕانی و ئەو چەمکانەی کە پەیوەستبوون پێوەی دەکرد، بۆیە ئەو بەناوبانگترین کەسە بۆ بەهێزکردنی ئەو چەمکە بەو پێیەی کە توانایەکی فیکری و نووسینی ناوازەی هەبووە، هەر لەو چوارچێوەیەدا چەمکی "جاهلیەت"یش خرایە ڕوو کە مەبەست لێی نازناو بوو بۆ ئەو کەسانەی حوکمیان بەوە نەدەکرد کە خوای گەورە ناردوویەتی و ڕێگاو رێبازی تریان دەگرتەبەر و بەرنامەی تریان پیادە دەکرد، دەرەنجام خاوەنی هەردوو کتێبی (في ظلال القرآن) و (معالم في الطريق) خۆیدا لەقەرەی ئەم دوو چەمکە (چەمکی حوکمڕانی و چەمکی جاهلیەت) لە زۆربەی لێکۆڵینەوە و نووسینەکانیدا، لەڕاستیدا بەتایبەت چەمکی حوکمڕانی کە یەکێکە لە گرنگترین چەمکەکان کە سەید قوتب دوای ئازادبوونی لە زیندان دەربارەی نووسیویەتی، وای بینیوە کە حوکمڕانەکان کاتێك کاروباریان گرتەدەست لە زۆربەی وڵاتانی ئیسلامیدا دوای شۆڕشەکانی ئازادیخوازیی، مافی "حوکمڕانی"یان داوە بەخۆیان کە لە بنەڕەتدا ئەوە مافی خوای گەورەیە و بۆ هیچ کەسێك رەوا نییە شەرعیەتی حوکمڕانی هەبێت مەگەر لەسەر ئەو بنەمایە بێت کە خوای گەورە دایناوە، کە ئەمەش لە چڵەپۆپەی گرنگیدانی تایبەتیەتی بەم چەمکە لە لێکۆڵینەوەکانی ئەم دواییانەیدا بەدەردەکەوێت، بەتایبەت لە کتێبەکانی "معالم في الطريق" و "مقومات المجتمع الإسلامي"دا، کە تیایاندا ئاماژە بۆ

بەدەستهێنانی شەرعیەتی رامیاری هەر حکومەتێك دەكات و پەیوەستی دەكات بە ئەندازەی وابەستەبوونی بە حوكمڕانی خوایی و دەستگرتنی بە مەنهەجی خوایی لە حوكمكردندا، بەڵام دەستی نەبردووە بۆ درێژەی ئەو حوكمڕانیە و هیچ باسێكی لە چۆنیەتی ئەو حوكمڕانیە بەدرێژی نەكردووە، چونكە ئامانجی ئەو تەنها وەخەبەرهێنانەوە و دروستكردنی هۆشیاریە لەلای گەل كە ئامانجەكانیان لەسەر دەستی ئەو حوكمڕانە نەتەوەییانەدا نەهاتۆتەدی و بەردەوام لەگەڵ بوونی سەربەخۆییشدا تۆمەتبارە بە دژایەتیكردنی ئایین و بیروباوەڕ و دیدی ئیسلامیی.

لەڕاستیدا سەید قوتب چەمكی "حوكمڕانی" لە فیكری سیاسی خۆیدا بە پلەیەكی بەرز پێشخست تا ئەو رادەیەی وشەی "لا إله إلا الله" لای ئەو بەمانای "تەنها فەرمانڕەوا خوای تاك و تەنهایە"و دەسەڵاتیش هەر بۆ ئەوە، ئەو لەمەدا جیاوازی نەدەكرد لە نێوان مانای "حوكمی خوایی" لە رووی حوكمڕانی سیاسی و حوكمڕانی خوای باڵادەست بۆ حوكمكردنی "گەردوون"، یان حوكمكردنی "دادوەری"، بەڵكو ئەمیش بەهەمان شێوەی "مەودودی"ی كرد كاتێ "حوكمڕانی خوایی" ڕووبەڕوو كردەوە لەگەڵ "حوكمڕانی مرۆڤ"دا كە پێچەوانە و ناتەباو دژە لەگەڵ پەرستشی خوایی و خوایەتیكردنی خوای بەرز و باڵادەست بۆ مرۆڤایەتی، هەروەك چۆن مەودودی هەر رۆڵێكی تاك و كۆمەڵی لە حوكمڕانیدا هەڵوەشاندەوە جگە لە وەرگرتن لەلایەن خواوە و پاشان جێبەجێكردنی بەو پێیەی حوكمڕان تەنها خوای باڵادەستە، سەید قوتب لەمەشدا بەهەمان شێوەی كرد..لەلایەن كەسانی تریشەوە هەر هەمان شێوە تێگەیشتن هەبوو بۆ

حوكمڕانی خوایی کـه لـه سـەردەمی مووسـادا هـەبوو بـۆ تێگەیشـتن لـەم چەمکە، کە لێیەوە وا تێگەیشـتوون خـوای پـاك و بێهاوتـا مەملەکـەتێکی تایبەتی سازکردووە و یاسا و کتێبی بۆ داناوە، ئەو یاسا و سیاسـەتانەش بەشێکی لێکدانەبڕاون لە ئایین و ئیمان و بیروباوەڕ و هیچ جیاوازیـەکیش نییە لەنێوان ئەو شتانەی دنیـایین و ئـەو شـتانەی بـۆ دواڕۆژن، هـەروەها لـەنێوان ئـەو شـتانەی شارسـتانین و شـتانی تـردا و زۆرێـك لـە کاروبـاری تریش.. ئابەم شێوە تێگەیشتنە لەم تێزە تێگەیشتبوون لەگەڵ ئەوەشـدا زۆرێك لە ئیسلامیەکان هەوڵیاندا ئەوەی مەودودی وتوویەتی و ئەوەی کـە سەید قوتب بۆی چووە لـەم بـوارەدا، راڤـەی بکـەن و رۆڵـی مـرۆڤ دیـاری بکەن لە تێگەیشتن و وەرگرتن، هەروەها ڕۆڵی لە بواری ئیجتیهادکردنـدا، بەڵام بۆچوون دەربارەی "حوکمڕانی خوایی" وەك ئەوەی کە لە کلتووری شارساتانیەتەکانی پێشوودا هەبوو تێکشکا، لە پێشیشیانەوە ئـەوەی لـە "کلتووری جوولەکە"دا هەبوو کە لەهەمان ئەو شێوە تێـزەی مـەودودی و سـەید قوتـب بـوو، هـیچ کـام لـەو راڤەکردنانـە و ئـەو بێدەنگبوونـەی لـە دۆزینەوەی جیاوازی لەنێوان تێگەیشتن لە ئەم و ئەودا، بەتایبەتی ئەوەی پەیوەستە بە عەقڵی خۆرئاوایی کە هەتا ئێستاش وابەستەیە بە کلتـووری تـەورات و ئینجیلـەوە، هـەتا ئێسـتاش وا دەڕوانێتـە ئـەو بۆچـوونە وەك ئەوەی ئەو بۆچـوونە دەسـتی گرتبێـت بەسـەر سروشـتی مرۆڤبووندا بـۆ بەرژەوەندی سروشتی خوایی بوون، ئەمەش بۆچوونێکە وا خۆی دەبینێت کە لەپاش ململانێیەکی دوورودرێژ خـۆی لـێ دەربـاز کردبێـت، دەرەنجـام هەموو ئەو وێنا نەشیاوانەی لێ داڕنیوە و بەم شێوەیە لێی تێیگەیشتووە،

لەهەمانکاتیشدا زۆرێك لە ئیسلامیەکان، ئیتر راڤەکاری بۆچوونەکانی ئـەو دوو پیـاوە بـن، یـاخود خـاوەنی دەستپێشـخەری تایبـەت بـەخۆیانبن، هەسـتاون بـە هـەڵێنجانی ئـەو چـەمکە باوانـەی حـوکمڕانی و دەوڵـەت و بـەهاکانی دەسـەڵات و شـەریعەت لەکاتێکـدا ئـەوان ئایەتـەکانی قورئـانی پـیرۆز دەخوێننـــەوە، بەتایبـــەت ئایەتـــەکانی ســـورەتی "المائـــدة" و فـەرموودەکانی پێغەمبـەر ﷺ و راسـتی رووداوە مێژووییـەکان، تـا ئـەو چەمکە هاوچەرخانە لەسەر ئەو دەقانە و لەسەر ئەو راستییانە پەکبخەن، ئـالێرەوە ئـەو چـەمکە بـەرەوڕووی ئاڵۆزیـەکی زۆر بوویـەوەو وای لێهـات پێویسـتی بـە زۆرێـك لـە کـرداری شـرۆڤەو شـیتەڵکردنەوە و سـەرلەنوێ داڕشـتنەوە هـەبێت، تـاوەکو بەشـێوەیەکی خـراپ لـە هـەموو ئیسـلام تێنەگەن بەهۆی تێگەیشتنێکی خراپ لەم چەمکە.

لەڕاسـتیدا چـەمکی "حـوکمڕانی خـوایی" بـەهۆی ئـەو هـەوڵ و راڤەکردنانەی کە ئەنجامدران لەلایەن هەنـدێك لـە نووسـەرانی بزووتنـەوە ئیسلامیەکانەوە لە واتاکەی خۆی ترازێنرا تا ئەو رادەیەی نزیککرایەوە لە وشـەی یەکتاپەرسـتی "توحیـد"، بـەجۆرێك هـەموو پێکهاتـەکانی یەکتاپەرستی و پایەکانی بیروباوەڕ وەك "الولاء و البراء"[١] و هەندێ شتی تریشی پێوە پەیوەستکرا، بۆیە جۆرێك لە خراپ حـاڵیبوون و ئـاڵۆزبوونی لە تێڕوانین لەنێو کۆمەڵگای ئیسلامیدا دروست کرد، ئەمەش بوویـە هـۆی

[١] الولاو والبراو: دوو چەمکی عەقیدەیین بەکورتی مەبەست لێیان دەربڕینی خۆشەوستی و پشتیوانی بۆ موسوڵمانان و بێبەری بون و وازهێنان لە کۆمەکی و دڵ بەلادا چونی کافرانە. وەرگێڕ

زیادکردنی هۆکارێکی تری لێکترازان و ململانێ بۆ سەر ئەو هۆکارانەی تری لێکترازان و ململانێ کە دەرهاویشتەی ئاڕاستەکانی تازەگەری و نوێخوازیە، بۆیە کرداری سەرلەنوێ رێکخستنەوەی لاپەڕەکان و راستکردنەوەی بارودۆخەکە لەم بوارەدا بووەتە کارێکی زۆر گرنگ، هەروەها بۆ ئەوەی ئەم چەمکە بخەینەوە شوێنی گونجاوی خۆی پێویستە بیر لە کارانێك بکەینەوە کە بە شتانێکی ئاسایی هەژمار دەکرێن، بەڵام لەڕاستیدا لەم بوارەدا زۆر گرنگە.

لەڕاستیدا ئایینی ئیسلام لە سەرەتادا بە جیهانی هات، وەك پەیام و وەك گوتاریش ﴿وَمَا أَرْسَلْنَاكَ إِلَّا كَافَّةً لِّلنَّاسِ بَشِيرًا وَنَذِيرًا وَلَكِنَّ أَكْثَرَ النَّاسِ لَا يَعْلَمُونَ﴾ (سبأ: ٢٨) واتە: {لە ڕاستیدا ئەی پێغەمبەر ﷺ ئێمە تۆمان ڕەوانە کردووە بۆ سەرجەم خەڵکی سەرزەوی لە هەموو سەردەمەکاندا تا کۆتایی دنیا، مژدەبەخشیت بە ئیمانداران و بێدارکەرەوەی بۆ هەموو مرۆڤەکان (هەتا کۆتایی دنیا)، بەڵام زۆربەی خەڵکی دەرکی ئەم ڕاستیە ناکەن و لێی تێناگەن}، سیفەتی جیهانیبوون لەم پەیامەدا مانایەکی زۆر گرنگ لەخۆدەگرێت ئەویش توانای لەخۆگرتنی هەموو جیهانە، بەجۆرێك لەناو ئەم پەیامەدا کەسێکی ئاسایی و ئەفریقی و هیندی و عەرەبی و تورکی و ئەوروپایی و ئەمریکایی و جگە ئەمانەش دەتوانێت هەر پێویستییەکیان هەبێت بۆ رێنوێنی و بۆ گەیشتن بەڕاستی دەستیان بکەوێت، چۆن دەکرێت ئەگەر گوتارێك بۆ تەنها یەك نەتەوە بێت، دەتوانێت هەموو مرۆڤایەتی لەخۆبگرێت ئەگەر ئەو گوتارە توانای نەبێت

بـۆ لـەخۆگرتنی تایبەتمەندییـەکانی و هـەموو جۆرەکـانی رۆشـنبیری و پرۆگرامە مەعریفیەکانی؟

لەڕاستیدا هەندێك کەس گومانی هەیە لە سیفەتی گوتـاری ئیسـلامی، گومانیان وایـە کـە تـەنها گوتـارێکی عەرەبیـە، ئـەویش لـە روانگـەی دوو پرسەوە:

یەکەم: قورئانی پیرۆز بەزمانی عەرەبیە و جگە عەرەب لێی تێناگـات، کە پێویستە لەسەر خوێنەر بۆ تێگەیشتن لێـی بگەڕێتـەوە بـۆ بنـەماکانی زمانی عەرەبی و قامووس و فەرهەنگە عەرەبیەکان.

دووەم: قورئـانی پـیرۆز بەسـتراوەتەوە بـە هۆکـاری دابەزینـەوە کـە تایبەتە بە عەرەب، هەروەها پێویسـتی بـە نموونـە هەیـە کـە ئـەویش لـە ژینگەی عەرەبیدا دەست دەکەوێت، بۆ نموونە: ﴿**أَفَلَا يَنظُرُونَ إِلَـى الْإِبِـلِ كَيْفَ خُلِقَتْ**﴾ (الغاشية: ١٧) واتە: {ئایا ئەو خەڵکە سەرنجی وشتر نادەن کە چۆن دروستکراوە}، هەروەها لە ڕووی کلتـوورەوە لـە پرسـێکی وەك منداڵ هەڵگرتنەوە و بەخشینی نازنـاوی کەسـی هـەڵگروە بـە منداڵەکـە و پرسی فرەژنی و ململانێیان لەگەڵ جوولەکەکانی مەدینەدا، بەهەمانشێوە چیرۆکی پێغەمبەران کە باسیان لێوەکراوە، شوێنەکانیان دەکەوێتە نێوان رووباری نیل و فوورات و نیمچە دوورگەی عەرەبیەوە، نەك هەموو جیهان، لەبەر ئەم هۆکارانەیە گووتراوە ئەم پەیامە تەنها تایبەتـە بـە عەرەبـەوە، بەهەمانشێوە گوتاری قورئانی پیرۆزیش تایبەتە بە عەرەب، ئەوەشی کـە

پەیوەستە بە بڵاوبوونەوەی ئایینی ئیسلام لە دەرەوەی بازنـەی عـەرەب بە هۆی فتوحات و جەنگەوە بووە.

ئێمە هەموومان دەرك بە مانای ئەم ئایەتە دەکەین: ﴿وَمَا أَرْسَلْنَاكَ إِلَّا كَافَّةً لِّلنَّاسِ بَشِيرًا وَنَذِيرًا وَلَكِنَّ أَكْثَرَ النَّاسِ لَا يَعْلَمُونَ﴾ (سبأ: ٢٨) واتـە: {لە ڕاستیدا ئەی پێغەمبەر ﷺ ئێمە تۆمان ڕەوانە کردووە بۆ سـەرجەم خەڵکی سەرزەوی..}، بەڵام ئایا تا چ رادەیـەك ئێمـە دەتـوانین پاڵنـەری ئەم جیهانیبوونە بین و رێکارەکانی بۆچوونە پێچەوانەکان ڕەتبکەینـەوە؟ لەگەڵ ئەوانەی کە باسمانکرد لەمانەی خوارەوەدا کورت دەبێتەوە:

ئەویش ئەوەیە قورئانی پیرۆز عەرەبیە و وابەستـە و ئالودەیـە لەگـەڵ ژینگـەی عەرەبیـدا و گوتارەکـە ئاڕاسـتەی ئـەو کـراوە، هـیچ دەقێکـی دیاریکراویش نییە بتوانێت ئیستیعابی هـەموو جموجوڵـەکانی مرۆڤایـەتی بکات، لەکاتێکدا ئەم پێش چواردە سەدە دابەزیوە، دوای ئـەو ماوەیـەش گۆڕانکاری کۆمەڵایەتی و مێژوویی روویانداوە و هەموو جیهان لـە قۆنـاغی ژیانی ئاژەڵداری و کشـتوکاڵی و ئـابووری و سروشـتیەوە گواسـتیەوە بـۆ قۆناغی پیشەسازیی و شۆڕشی فیزیایی و تەکنەلۆجی؟!

لەڕاسـتیدا سـیفەتی جیهـانیبوون کـە سـیفەتێکی تایبـەتی قورئـانی پـیرۆزە، پرسـێکی زۆر گـەورە دەوروژێنێـت، کـە ئـەویش پرسـێکی بابەتییانەیـە لەسـەر ئاسـتی گشـتی و پێویسـتە عەقڵـە موسـڵمانە هاوچـەرخەکە روونکردنـەوە لەسـەر کۆمـەڵێك راسـتی بـدات، تـا بتوانێـت ڕووبەڕووی ئەو لۆجیکە ببێتەوە کە پشت دەبەستێت بەو پێکهاتانەی کـە

باسمــانکردن، لەڕاستیشــدا بەرپرســیارێتی خســتنە ئەســتۆی گوتــاری ئیسـلامیی هاوچـەرخ بـۆ چارەسـەرکردنی پرسـی نەتـەوەیی کـە ئێسـتا ڕووبەڕووی عەرەب بووەتەوە، ئەویش قوڵکردنەوەی ئەو دیدە هەڵانەیە.

بەرپرسیارێتی خستنە ئەستۆی ئیسلام بۆ چارەسەرکردن و چاککردنی ئـەم دۆزە ناوچـەیی و ژینگەییـە و هـەموو ئـەو نەهامەتیانـەی تووشـی موسڵمانان بووەتـەوە، کـە دەرەنجامی لادانیانـە، سـتەمێکە لـە ئیسـلام دەکرێـت، چ سـتەمێك! لەکاتێکـدا موسـڵمانان ڕووبـەڕووی خـراپترین و مەترسیدارترین هێرش بوونەتەوە ڕێگەپێدراون بۆ بەکارهێنانی هەر جۆرە چەکێك کە لەبەردەستدا بێت، بەڵام ناکرێت خودی ئیسلام بکرێتە هۆکار و کاڵایـەك لـە کاڵاکـانی ململانێکـە، چـونکە ئـایینی خـوای باڵادەسـتە و پەیامەکەی بۆ هـەموو مرۆڤایەتیـە، پێویستیشـە تایبەتمەندییـەکانی ئـەم ئایینە لەنێو گشت خەڵکیدا بڵاوبکرێتەوە، گرنگترینیان:

١- قورئانی پیرۆز ئەگەرچی وشەکانی بـە زمـانی عـەرەبی دابـەزیوە، بـەڵام لـە ماناکەیـدا ڕەهایـە، پانتاییـەکی گشـتگیر و کۆکەرەوەیـە لـە ئاسـتێکی هەمەلایەنـەدا بـۆ گـەردوون و جموجـوڵ و پەیـدابوونی، لـەنێو ئەوانەشدا هەماهەنگبوونە ژیاریی و مەعریفیەکانیش کـە لـەدوای ئـەوەوە هاتوون.

٢- پەیوەنـدی قورئـانی پـیرۆز بـەو ژینگـە عەرەبیـەی کـە تیایـدا دابەزیوە، پەیوەندییەکی ڕەهاییبوون لەگەڵ ڕێژەییبووندا، سـنووردارکراو لەگـەڵ سـنووردارنەکراو، دیـاریکراو لەگـەڵ دیارینـەکراو، فـەرموودەکانی

پێغەمبەریش هەڵدەستێت بە رۆڵی روونکـەرەوە بـەجۆرە پرۆگرامێـك کـە رەها قورئانییەکان پەیوەست دەکات بە واقیعە رێژەییەکەوە.

٣- گوتاری قورئانی دەقێکی دیاریکراو و کۆتا نەهاتووە لەسەر ئاستی واتاکان و لقەکانی، ئەگەرچی لەسەر ئاستی وشەکان دەقێکی دیاریکراو و کۆتا هاتووە.

٤- دابەزینی قورئانی پـیرۆز پـێش چـواردە سـەدە دوو تایبەتمەنـدیی لەخۆدەگرێت: زاڵبوون و پەیبردن بە سەردەمەکانی پێش خـۆی و توانـای لەخۆگرتن و خۆگونجاندنی لەگەڵ ئەو سەردەمانەی کە دواتر دێن، کەواتە دانپیانەرو و هەژموونداره بەسەر ئەوانەی پێشـوودا و زاڵ و بەتوانایـە بـۆ لەخۆگرتن و تێپەڕاندنی ئەو شتانەی کە دواتر دێن، کەواتە جیهانیبوونی ئیسلام بە تێگەیشتن لـە تایبەتمەندییـەکانی قورئـان دەسـتپێدەکات، کـە گوتـارە جیهانیبوونەکـەی توانـای لـەخۆگرتن و لەهەمانکاتیشـدا توانـای تێپەڕانـدنی ئاڵۆزییـەکانی گشـت شـێوازە ژیـاریی و سیسـتمە مـەعریفی و هەسـتیەکانی هەیـە، نـەك تـەنها لـە رابـردوودا، بـەڵکو لـە ئێسـتا و لـە دواهاتووشدا، نەك تەنها بۆ عەرەب و گەلە جۆراوجۆرەکـان کـە باوەڕیـان پێ هێناوە لە کاتی یەکەم چـریکەی هەڵهاتنیـەوە لـەنێو گـەلانی جیهـانی کۆندا، لـە فارسـەکان، هیندییـەکان، تورکـەکان و جگـە ئەمانـە و گـەلانی تریش، بەڵکو بۆ هەموو مرۆڤایەتی، ئەوان بەو جـۆرە لێـی تێگەیشـتبوون کـە دەسـەڵاتدارییەکەی هاوتایـە لەگـەڵ هـەموو گەردوونـدا، بـەڵام ئێمـە لێناگـەڕێین تـا ئـەو هەوڵـە پێویسـتە بـە یـەك گوژمـە تـەواو ببێـت، بۆیـە

تایبەتمەندیی جیهانیبوون لەگەڵ دەرکەوتنی لە قورئانی پیرۆزدا و لەگەڵ ڕەوڕەوەی مێژووی ئیسلامیدا، تائێستا نەکراوەتە پرۆگرام، یاخود بە پرۆگرامکردن، بەڵام جیهانیبوون و کۆتایهاتنی پێغەمبەرایەتی و دەسەڵاتداریێتی قورئان، هەموویان تایبەتمەندیەکی لێکئاڵێنراون و یەکتری بەهێز دەکەن، هەر تایبەتمەندییەکیان گوزارشت لەوی تر دەکات، ئەگەر پلەبەندی بۆ بکرێت بە پلەبەندیەکی دروست و رێك (لە ڕووی هزر و مەعریفەوە) بەم شێوەیەی خوارەوە:

أ- بۆ ئەوەی گوتارەکە جیهانی بێت، ئەوا پێویستمان بە "کۆتایی هاتنی پێغەمبەرایەتی"یە، ئەویش بۆ یەکخستنی ڕووگەی مرۆڤایەتی، ئەوکات رێگا لە فرە بەدوای یەکدا هاتنی پێغەمبەرایەتی دەگیرێت و دواتریش ڕێگا لە ڕوودانی سڕینەوە و دژبەیەکبوون و پەرتبوون و جیاوازبوون دەربارەی ئەو پێغەمبەرایەتیانە دەگیرێت، با مرۆڤە خوێندەوارەکانیش بەرپرسیارێتی سەرشانی خۆیان هەڵبگرن.

ب- بۆ ئەوەی گوتارەکە جیهانی بێت، پێویستە قورئانی پیرۆز رزگار بکەین لەو تایبەتمەندیەی کە پەیوەستە بە ژینگەی دابەزینەکەیەوە، هەر بەمەش فەرمانکرا بە پێغەمبەری خوا ﷺ و بە جوبرائیل بۆ دووبارە ریزبەندکردنەوە بۆ شوێنی ئایەتەکانی قورئانی پیرۆز، ئەمەش وەك سرووش و هەماهەنگی لەسەردەستی پێغەمبەری خوا ﷺ پێش گەشتنەوەی بە یاوەری بەرز و بڵندی خۆی، بەمەش ئەوە روون دەبێتەوە کە کامە لە ئایەتەکان رەهایە و کامەیان رێژەییە.

ت- بۆ ئەوەی گوتاری قورئانی جیهانی بێت پێویستە ئەو شەریعەتانەی تایبەت و پەیوەستن بە گەل و نەتەوەیەکی دیاریکراوەوە نەسخ ببنەوە، کە بریتین لە شەریعەتگەلێکی پڕ گرێ و کۆتوبەند، تا شەریعەتە گشتیەکەی قورئانی پیرۆز بخرێتە جێگای کە دەگونجێت لەگەڵ پێداویستیەکانی هەموو کۆمەڵگەکانی جیهاندا، هەروەها لە دووتوێیدا هەڵگری توانای گشتگیری و گشتیبوونی تێدایە تا ببێتە هاوبەشێکی مرۆڤانە و شیاو بۆ جێبەجێکردنی لە هەموو شوێنە جۆراوجۆرەکانی جیهاندا، شەریعەتێکە راوەستاوە لەسەر ئاسانکاری و بەزەیی و سۆز و، رێکخستنی جوڵەی مرۆڤەکان لەچوارچێوەی دەستپاکی و جێنشینی و ئاوەدانکاری و تاقیکردنەوەدا.

پ- بۆ ئەوەی گوتارەکە جیهانی بێت، پێویست دەکات دەقە زمانەوانیە دیاریکراوەکان واتایەکی رەها لەخۆبگرن، کە دواتر ئاشکرا دەبن لەرێگەی دۆزینەوەی "مەنهەجیبوونی مەعریفیانەی قورئانی پیرۆزەوە" لەچوارچێوەی "یەکبوونە بنیاتنەرەکەیەوە".

کاتێك ئێمە بەم راستیە گرێدراوانەوە هەنگاو دەنێین بەوپێیەی ئەمانە گریمانەی زانستی و بابەتین و پەیوەستکردنیان جەخت لە جیهانیبوونی گوتارە ئیسلامیەکە دەکەنەوە، لەراستیدا هەندێك لەو تایبەتمەندیە قورئانیانەمان بۆ دەردەکەوێت کە بریتین لەو شتە هەستپێکراوانەی کە لەبەردەستماندان، بەڵام پێشتر ئاوڕمان لە جێکەوتە مەنهەجیەکانی نەداوەتەوە، بۆ نموونە: کۆتایی هاتنی پێغەمبەرایەتی، شەرعیبوونی

ئاسانکاری و بەزەیی و سۆز، دەسـەڵاتداریێتی رەهـای قورئـان بـە هـەموو مانا مرۆییەکانیەوە، هاتنەوەی لەگەڵ هەموو سەردەم و شوێنەکاندا، بۆیە گوتاری مێژوویی لە قورئانی پیرۆزدا کە یەکەمجار بـە حاڵەتـە خێزانیەکـە دەستپێدەکات و باسی ئادەم دەکات: ﴿وَقُلْنَا يَـا آدَمُ اسْـكُنْ أَنـتَ وَزَوْجُـكَ الْجَنَّـةَ وَكُـلاَ مِنْهَـا رَغَـداً حَيْـثُ شِـئْتُمَا وَلاَ تَقْرَبَـا هَـذِهِ الشَّـجَرَةَ فَتَكُونَـا مِـنَ الْظَّالِمِينَ﴾ (البقرة: ٣٥) واتە: {ئینجا بە ئادەممان وت: لە ئێستە بە دواوە تۆو هاوسەرەکەت لەو بەهەشتەدا نیشتەجێ ببن ، جا لەوێ حەز لـە چـی دەکەن، لەکوێدا سەیران دەکەن ئارەزووی خۆتانە، هەروەها بۆتان هەیـە لە هەرچی بەروبومی بەهەشتە سودوەرگرن و بە تێروتەسەلی لێی بخـۆن، بەڵام نزیکی ئەو درەختە مەکەون ، چونکە ئەگەر ئەو سنووره بشکێنن و فەرمانی من ئەنجام نەدەن، ئەوە دەچـنە ریـزی سـتەمکارانەوە}، دواتـر پلەبەندیەکە بەکاردەهێنێت تا دەربارەی حاڵەتێکی خێڵایەتی بـدوێت کـە فراوانترە لە حاڵەتە خێزانیەکـە: ﴿ يَـا بَنِـي إِسْـرَائِيلَ اذْكُـرُواْ نِعْمَتِـيَ الَّتِـي أَنْعَمْتُ عَلَيْكُمْ وَأَوْفُـواْ بِعَهْـدِي أُوفِ بِعَهْـدِكُمْ وَإِيَّـايَ فَـارْهَبُونِ﴾ (البقـرة: ٤٠) واتە: {ئەی نەوەی ئیسرائیل! ئێوە حەق وایە هەمیشەو بەردەوام یـادی ئـەو نـاز و نیعمەتانـە بکەنـەوە کـە ڕشـتومە بـە سـەرتاندا ، لەبەرئـەوە داواکـارم کــە بــەوەفا و بــە ئەمــەك بــن بەرامبــەر ئــەو پەیمانــەی کــە لێموەرگرتــوون کــە خوانــاس و دینــداربن تــا منــیش وەفــا بکــەم بــە پەیمانەکـەم، جـا بـۆ دەسـتەبەرکردنی ئـەو بەڵێنانـە، ئێـوە هەمیشـە و بەردەوام لە مـن بترسـن و حسـابی جـدی بـۆ هەڕەشـەکانی مـن بکـەن}، پاشان بەردەوام دەبێت تا گوتار لەگەڵ حاڵەتێکی تری هۆزگـەرایی بکـات

که زۆر فراوانتره له خێـزان: ﴿وَكَـذَلِكَ أَوْحَيْنَـا إِلَيْـكَ قُرْآنًـا عَرَبِيًّـا لِّتُنـذِرَ أُمَّ الْقُرَى وَمَنْ حَوْلَهَا وَتُنذِرَ يَوْمَ الْجَمْعِ لَا رَيْبَ فِيهِ فَرِيقٌ فِـي الْجَنَّـةِ وَفَرِيـقٌ فِـي السَّعِيرِ﴾ (الشـورى: ٧) واتـه: {ئـا بـەو شـێوەیەی کـە دەیزانیـت ئێمـە قورئانێکمـان بـەزمانێکی عـەرەبی پـاراو لـە ڕێگـەی وەحـی و نیگـاوە بـۆ ڕەوانە کردویت بۆ ئەوەی شارە دێرینەکە و دەوروبـەری بێـدار بکەیتـەوە (کە مەککە و هەموو سەرزەوی دەگرێتەوە) تا ئەو خەڵکە ئاگادار بکـەیت لە ڕۆژی کۆبوونەوە گـەورە و فراوانەکـە کـە هـیچ گومـان لەبەرپاکردنیـدا نییە، ئەو ڕۆژە دەسـتەیەك لـەو خەڵکـە شایسـتەی بەهەشـت و هـەروەها دەستەیەکیش شایستەی دۆزەخ دەبـن بـەهۆی بەدبـەختی و بـێ دینـی و تاوان و ستەمیانەوە}، ﴿وَأَنذِرْ عَشِيرَتَكَ الْـأَقْرَبِينَ﴾ (الشـعراء: ٢١٤) واتـه: {ئەی محمد ﷺ جارێ سـەرەتا، خزمـانی نزیکـت، هـۆز و تـیرەی خـۆت بێدار و هۆشیار بکەرەوە بەم پەیامـە}، ﴿وَإِنَّـهُ لَـذِكْرٌ لَّـكَ وَلِقَوْمِـكَ وَسَـوْفَ تُسْأَلُونَ﴾ (الزخرف: ٤٤) واته: {لەڕاستیدا ئەم قورئانە یادخەرەوەیـە بـۆ خۆت و قەومەکەشت لـە هـەموو ڕوویەکـەوە تـا پابەنـدی بـن و پـەیڕەوی بکـەن، لـە ئایندەشـدا پرسـیارتان لێ دەکرێـت دەربـارەی (تەمـەنتان، زانسـتتان، سـامانتان، کـاتی بـێ کاریتـان، تەندروسـتیتان، چـیتان تێـدا کردووە و چۆنتان بـەکارهێناوە؟!} پاشـان زیـاتر بـەرز دەبێتـەوە دوای پەیوەسـتبوون بـە هـۆز و خزمـە نزیکـەکانی لـە ئاگادارکردنـەوەیان تـا کەسانی تری دوای ئەوانیش بگرێتەوە، بۆ ئەوەی گوتارەکـەی ئاڕاسـتەی هەموو مرۆڤایەتی بکات، تا رووی گوتاری بکاتە گەل کە زۆر فراوانترە لـە هۆز و خێڵ، خوای گەورە دەفەرموێت ﴿هُوَ الَّذِي بَعَثَ فِـي الْـأُمِّيِّينَ رَسُـولًا

مِّنْهُمْ يَتْلُو عَلَيْهِمْ آيَاتِهِ وَيُزَكِّيهِمْ الْكِتَابَ وَالْحِكْمَةَ وَإِن كَانُوا مِن قَبْلُ لَفِي ضَلَالٍ مُّبِينٍ﴾ (الجمعة: ٢) **واته:** {هەر ئەو زاتە خۆی لە نێو خەڵکێکی نەخوێندەواردا کەسێکی لە خۆیان هەڵبژارد و کردی بە پێغەمبەر و ڕابەریان زۆر بەجوانی، ئایەتەکانی قورئانی بۆ دەخوێندنەوە، هەوڵی دەدا کە دڵ و دەروون و کردار و گوفتاریان خاوێن و جوان بکات، هەروەها فێری قورئان و دانایی و شەریعەت و بانگەواز و خۆگرییان بکات، هەرچەندە ئەوان پێشتر لە گومڕایی و سەرلێشێواوی و سەرگەردانی و ستەمێکی ئاشکرادا گیریان خواردبوو}، واتە: ئەو گەلانەی کە پێشتر نێردراو، یان پێغەمبەریان بۆ نەهاتووە، لێرەدا لێدەگەڕێین بۆ ئیمامی شافیعی – بەڕەحمەت بێت– تا ئەو بە ڕوونکردنەوە ناوازەکەی ئەم دیاردەیە ئاشکرا بکات، دەفەرموێت: "کاتێ ئەو بوویە پێغەمبەر، خەڵکی دوو پۆل بوون، یەکێکیان: خاوەن کتێبەکان کە هەستان بە گۆڕینی حوکمەکانی ناو کتێبەکەیان و بێباوەڕی بە خوای بەرز و باڵادەست، بە زمانیان درۆیان هەڵدەبەست و تێکەڵیان دەکرد بە ڕاستیەکانی خوای باڵادەست، کە بۆی ناردبوون، خوای گەورە باسی کافربوونیان بۆ پێغەمبەرەکەی دەگێڕێتەوە و دەفەرموێت: ﴿وَإِنَّ مِنْهُمْ لَفَرِيقًا يَلْوُونَ أَلْسِنَتَهُم بِالْكِتَابِ لِتَحْسَبُوهُ مِنَ الْكِتَابِ وَمَا هُوَ مِنَ الْكِتَابِ وَيَقُولُونَ هُوَ مِنْ عِندِ اللّهِ وَمَا هُوَ مِنْ عِندِ اللّهِ وَيَقُولُونَ عَلَى اللّهِ الْكَذِبَ وَهُمْ يَعْلَمُونَ﴾ (آل عمران: ٧٨) واتە: {هەندێك لە حاخامەکانی جوو، یاخود قەشەی گاورەکان جۆرێك ئاخاوتن دەکەن و زمانیان با دەدەن، گوایە تەورات و ئینجیل دەخوێننەوە، لە حاڵێکدا ئەوە فڕی بە کتێبی ئاسمانیەوە نییە،

کەچی ئەوانە بێشەرمانە دەڵێن: ئەمـەی دەیخـوێنن هـەر ئەوەیـە کـە لـە لایەن خوای گەورە بە موسـا و عیسـا دراوە، لەڕاستیشـدا ئـەوە وانییـە و دوورە لەو تەورات و ئینجیلـەی کـە لەلایـەن خـواوە ڕەوانـەکراوە بۆیـان، ئەوانە هەردەم بەناوی خواوە درۆ هەڵدەبەستن، چاکیش دەزانن کە درۆ و بوختان دەکەن، ئەوانە لەڕاستیدا بەناوی خواوە بوونەتە کۆسپ لەڕێگەی هیدایەتی خەڵکیدا}، وە ﴿فَوَيْلٌ لِّلَّذِينَ يَكْتُبُونَ الْكِتَابَ بِأَيْـدِيهِمْ ثُـمَّ يَقُولُـونَ هَذَا مِنْ عِندِ اللّهِ لِيَشْتَرُواْ بِهِ ثَمَناً قَلِيلاً فَوَيْلٌ لَّهُم مِّمَّا كَتَبَتْ أَيْدِيهِمْ وَوَيْلٌ لَّهُمْ مِّمَّا يَكْسِبُونَ﴾ (البقرة: ٧٩) واتە: {هـاوار و وەیـل و ئـاه و ناڵـە بـۆ ئـەو کەسانەی کە بە دەستی خۆیان کتێب دەنووسـن و پاشـان دەڵـێن: ئەمـە کتێبی خوایە و خوای گەورە ڕەوانەی کردووە تا بەو کارەیـان پارەیـەکی کـەمیان دەسـت بکـەوێت، هـاوارو وەیـل و ئـاه و ناڵـە بـۆ خۆیـان و ئـەو شتانەی کە بە دەست و خەتی خۆیان دەینووسن، هەروەها هاوارو وەیل و ئاهو ناڵە بـۆ ئـەو کەسـابەت و کـارەی کـە ئـەنجامی دەدەن}، هـەروەها دەفەرموێت: ﴿وَقَالَتِ الْيَهُودُ عُزَيْرٌ ابْنُ اللّهِ وَقَالَتْ النَّصَارَى الْمَسِيحُ ابْنُ اللّـهِ ذَلِكَ قَوْلُهُم بِأَفْوَاهِهِمْ يُضَاهِؤُونَ قَوْلَ الَّذِينَ كَفَرُواْ مِـن قَبْـلُ قَـاتَلَهُمُ اللّـهُ أَنَّـى يُؤْفَكُونَ * اتَّخَذُواْ أَحْبَارَهُمْ وَرُهْبَانَهُمْ أَرْبَابًا مِّن دُونِ اللّهِ وَالْمَسِيحَ ابْنَ مَـرْيَمَ وَمَا أُمِرُواْ إِلاَّ لِيَعْبُدُواْ إِلَهًا وَاحِدًا لاَّ إِلَهَ إِلاَّ هُوَ سُبْحَانَهُ عَمَّا يُشْرِكُونَ﴾ (التوبة: ٣٠ — ٣١) واتە: {جولەکـە بـە هـەموو عەقڵیانـەوە دەڵـێن: عـوزەیر (کـە یەکێکە لە پێغەمبەرانی خوا) کوڕی خوایە!! نەسرانیەکانیش بـە هـەموو عەقڵیانەوە دەڵێن: مەسیح کوڕی خوایە!! هەر ئەو قسە نادروستە و ئەو بوختانە ناقۆڵایە دەڵێن و دووپاتیشی دەکەنەوە، بە دەم و زاریان دەیڵێن

لەڕاستیدا ئەو گوفتـارە نادروسـت و سـەقەتەیان لـە قسـەی ئـەو کافرانـە دەچێت (کە دەیانووت: فریشتەکان کچی خوان! !) دەك بە کوشت بچن و خوا لەناویان بەرێت بۆ بوختانی ناڕەوا و گووفتاری نابەجێیان، (جوولەکە و مەسیحیەکان) بەزۆری حاخام و قەشـەکانی خۆیـان، وەك خـوا تەماشـا دەکەن و حسابی خوایان بۆ دەکەن (کاتێك عـەدی کـوڕی حاتـەم ئەمـەی بیسـتووە لـە خزمـەتی پێغەمبـەردا ﷺ وتوویـەتی: یـا رسـول الله، کـوا نەمـدیوە بیانپەرسـتن، ئـەویش فەرموویـەتی: باشـە، حـەڵاڵیان لێ حـەرام نەدەکردن؟! حەرامیان بۆ حەڵاڵ نـەدەکردن؟! عـەدی وتـی: بـەڵێ ئـەی پێغەمبـەری خـوا، ئـەویش فـەرمووی: ئـەوە جۆرێکـە لـە پـەرسـتنیان)، هەروەها مەسیحی کوڕی مەریـەمیش دەپەرسـتن، بەمـەرجێك هـەموویان فەرمانیان پێدراوە کە تەنها خوایەکی تاك و تەنها بپەرستن، جگە لەو زاتە خوایەکی تری بەحەق نییە کە شایستەی پەرستن بێت، پاکی و بێگـەردی و ستایش هەر شایستەی ئەو زاتەیە کە بەتـەواوی دوورە لـەو حاڵـەی کـە ئەو نەفامانە ئاوا بە گێلی شەریك و هاوەڵی بۆ بڕیار دەدەن، (هەنـدێ لـە پێغەمبـەرانی خـوا بـە کـوڕی ئـەو زاتـە نـاوزەد دەکـەن! !}، دیسـان دەفەرموێت: ﴿أَلَمْ تَرَ إِلَى الَّذِينَ أُوتُواْ نَصِيبًا مِّنَ الْكِتَابِ يُؤْمِنُونَ بِالْجِبْتِ وَالطَّاغُوتِ وَيَقُولُونَ لِلَّذِينَ كَفَرُواْ هَؤُلاء أَهْدَى مِنَ الَّذِينَ آمَنُواْ سَبِيلاً * أُوْلَئِكَ الَّذِينَ لَعَنَهُمُ اللّهُ وَمَن يَلْعَنِ اللّهُ فَلَن تَجِدَ لَهُ نَصِيرًا﴾ (النسـاء: ٥١ — ٥٢) واتـە: {ئایـا سـەرنجت نـەداوە لەوانـەی کـە کتێبـی ئاسمانیمـان پـێ بەخشـیون، کەچـی باوەڕیـان بـە فاڵچـی و جادووگـەر و بـت و پەیکـەر و شەیتان ....هەیە، وە دەربـارەی کافرەکـانی تـر دەڵێن: ئەوانـە ڕێبـاز و

ئاینێکی ڕاستتر و پەسەندتریان گرتووە، تا ئەوانەی کە شوێنی محمد ﷺ کەوتوون و ئیمان و باوەڕیان بە ئاینی ئیسلام هێناوە ! !، ئا ئەوانەی ئەوە بیروباوەڕ و هەڵوێستیانە لە جوولەکە و هاووێنەیان، ئەوانەن کە خوای گەورە نەفرینی لێ کردوون و لە سۆز و ڕەحمەتی خۆی بێبەشی کردوون، جا ئەوەی کە خوای گەورە نەفرینی لێ بکات، نابینیت کەس هاوکاری بکات و پشتیوانی لێ بکات}.

پاشان دەگوازێتەوە بۆ دیاریکردنی پۆلی دووەم: پۆلی بێباوەڕان بە خوای گەورە، ئەم پۆلە شتانێکیان داهێنا کە خوای گەورە رێگای پێنەداوە، بەدەستی خۆیان لە بەرد و تەختە پەیکەرێکی پەسەندکراویان دەکێشا و ناوێکیان لێدەنا، ئەگەر دواتر شتێکی تر بەلایانەوە پەسەندبوایە ئەوی پێشوویان فڕێ دەدا و بەدەستی خۆیان دانەیەکی تریان ساز دەکرد و دەیانپەرست، ئەمانەش عەرەبەکان بوون، هەندێکیش لە هۆزە عەجەمەکان هەمان رێگایان گرتەبەر و ئەوەی بەلایانەوە پەسەندبوو لە نەهەنگ و چوارپێ و ئەستێرە و ئاگر و شتی تریش دەیانپەرستن، خوای باڵادەست بۆ پێغەمبەرەکەی وەڵامی هەندێك لەوانە دەداتەوە کە جگە خوایان پەرستووە لەم پۆلە خەڵکانە، خوای گەورە لەسەر زاری ئەوان بۆ پێغەمبەرەکەی دەیگێڕێتەوە و دەفەرموێت: ﴿وَكَذَلِكَ مَا أَرْسَلْنَا مِن قَبْلِكَ فِي قَرْيَةٍ مِّن نَّذِيرٍ إِلَّا قَالَ مُتْرَفُوهَا إِنَّا وَجَدْنَا آبَاءنَا عَلَى أُمَّةٍ وَإِنَّا عَلَى آثَارِهِم مُّقْتَدُونَ﴾ (الزخرف: ٢٣) واتە: {هەر بەو شێوە ئێمە پێش تۆ هیچ پێغەمبەرێکمان ڕەوانە نەکردووە بۆ ئەو خەڵکە کە خۆشگوزەرانەکانیان (وەکو ئەمان) نەیان وتبێ، ئێمە باوانمان بینیوە

لەسەر ئاین و بیروباوەڕێکی تایبەت بوون، ئێمەش بەشوێن ئەواندا دەڕۆین و چاو لەوان دەکەین و پەیڕەوی لـەوان دەکـەین!!}، بـەڵام پێغەمبـەری خوا ﷺ وەفاتی نـەکرد و نەگەڕایـەوە بـۆ لای خـوای باڵادەسـت تـا ئـەو گوتارە مێژووییە خواییە فراوان بـوو، پێینایـە قۆنـاغی جیهـانیبوون دوای تێپەڕانـدنی قۆناغـەکانی خێـزان و خێـڵ و هـۆز و گـەل، ئـەوەبوو خـوای باڵادەست فەرمووی: ﴿يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُـواْ إِنَّ كَـثِيرًا مِّـنَ الأَحْبَـارِ وَالرُّهْبَـانِ لَيَأْكُلُونَ أَمْوَالَ النَّـاسِ بِالْبَاطِـلِ وَيَصُـدُّونَ عَـن سَـبِيلِ اللّـهِ وَالَّـذِينَ يَكْنِـزُونَ الذَّهَبَ وَالْفِضَّةَ وَلاَ يُنفِقُونَهَا فِي سَبِيلِ اللّـهِ فَبَشِّـرْهُم بِعَـذَابٍ أَلِـيمٍ﴾ (التوبـة: ٣٤) واتە: {ئەی ئەو کەسانەی ئیمان و باوەڕتان هێنـاوە چـاك بـزانن کـە زۆربەی حاخام و مالومەکانی جوولەکە و قەشە و پیاوانی ئاینی مەسیحی، ماڵ و سامانی خەڵکی بەناحەق دەخۆن و هەوڵیش دەدەن کـە بەربەسـت بخەنە بەردەم ئاینی خوا، بەردەوامیش کۆسپ و لەمپەر دروسـت دەکـەن لەبەردەم بڵاوبوونەوەیدا، جـا ئەوانـەی کـە زێـڕ و زیـو کەڵەکـە دەکـەن و قـایمی دەکــەن و لــە پێنــاوی پایــەداری و بڵاوبوونــەوەی ئــاینی خــوادا نایبەخشن، ئەوە مژدەی سزایەکی بەئێشیان بدەرێ!}، نموونەی هـەمان ئایەت لە سورەتی (الصف)دا هـاتووە: ﴿هُـوَ الَّـذِي أَرْسَـلَ رَسُـولَهُ بِالْهُـدَى وَدِينِ الْحَقِّ لِيُظْهِرَهُ عَلَى الدِّينِ كُلِّهِ وَلَوْ كَرِهَ الْمُشْرِكُونَ﴾ (الصـف: ٩) واتـە: {هەر ئەو خوایـە، بۆیـە پێغەمبەرەکـەی رەوانـە کـردووە بـە هیدایـەت و رێنموویی راست و دروست و ئـاینی حـەق و حەقیقەتـدا تـا سـەری بخـات بەسەر هەموو ئاین و بەرنامەکاندا، هەرچەندە موشریك و هاوەڵگەران پێی سـەغڵەت بـن و پێیـان نـاخۆش بێـت}، لـە سـورەتی "الفـتح"یشـدا

دەفەرموێت: ﴿هُوَ الَّذِي أَرْسَلَ رَسُولَهُ بِالْهُدَى وَدِينِ الْحَقِّ لِيُظْهِرَهُ عَلَى الدِّينِ كُلِّهِ وَكَفَى بِاللَّهِ شَهِيدًا﴾ (الفتح : ٢٨) واتە: {بێگومان هەر ئەو زاتە پێغەمبەرەکەی رەوانە کردووە هاوڕێ لەگەڵ هیدایەت و ئاینی حەق و راستیدا، تا سەری بخات بەسەر هەموو ئاین و ئایدۆلۆژیا و بەرنامەکانی تردا (لەسەر زەوییەکەیدا)، خوای گەورە خۆیشی بەسە بۆ شایەتیدان و پشتیوانی و سەرخستنی ئەو ئاینە پیرۆزە (لەگەڵ ئەو هەموو پیلان و نەخشە سامناك و زەبەلاحانەدا دژ بە ئیسلام و مسوڵمانان، ئاینی خوای پەروەردگار هەر لە گەشەسەندندایە} ، ئەمانە هاوتابوون لەگەڵ پلەبەندی گوتارە مێژووییە خواییەکە لەگەڵ حاڵەتە تەشریعیە جۆراوجۆرەکاندا، بۆیە بۆ هەر حاڵەتێکی جیاوازیش تەشریعێکی تایبەت بە خۆی هەیە، بۆ هەر پێغەمبەرێك لە پێغەمبەرەکان تایبەتمەندی دیاریکراوی خۆی هەیە و بۆ هەر یەکێکیان خوای گەورە پرۆگرام و شەریعەتێکی بۆ داناون[1].

هەربۆیە خوای بالآدەست لە سورەتی (المائدة)دا ئاگادارمان دەکاتەوە لە پێویستبوونی تێبینیکردنی تایبەتمەندی و جیاکەرەوە تەشریعی و مەنهەجییەکان، خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿وَأَنزَلْنَا إِلَيْكَ الْكِتَابَ بِالْحَقِّ مُصَدِّقًا لِّمَا بَيْنَ يَدَيْهِ مِنَ الْكِتَابِ وَمُهَيْمِنًا عَلَيْهِ فَاحْكُم بَيْنَهُم بِمَا أَنزَلَ اللّهُ وَلاَ تَتَّبِعْ أَهْوَاءهُمْ عَمَّا جَاءكَ مِنَ الْحَقِّ لِكُلٍّ جَعَلْنَا مِنكُمْ شِرْعَةً وَمِنْهَاجًا وَلَوْ شَاء اللّهُ لَجَعَلَكُمْ أُمَّةً وَاحِدَةً وَلَكِن لِّيَبْلُوَكُمْ فِي مَآ آتَاكُم فَاسْتَبِقُوا الخَيْرَاتِ إِلَى الله مَرْجِعُكُمْ جَمِيعًا فَيُنَبِّئُكُم بِمَا كُنتُمْ فِيهِ تَخْتَلِفُونَ﴾ (المائدة: ٤٨)

---

[1] الشافعي، محمد بن إدريس. الرساله، تحقيق: محمد أحمد شاكر، ص٨.

واتە: {پاشان ئێمە ئەم قورئانەمان نـازڵکرد بـۆ تـۆ ئـەی محمـد ﷺ کـە هــەموو حەقیقــەت و ڕاســتیەکانی لــە ئــامێزگرتووە، بــە ڕاســتدانەری کتێبەکانی پێش خۆیەتی و لەوانیش گـرنگتر و پایـەدارترە، چـونکە کۆتـا پەیامە هەرکاتێك ئەوان گێروگرفتێکیان بۆ پێش هات و هاتن بـۆ لای تـۆ، هەر بەو بەرنامەیەی خوای گەورە بۆی ڕەوانە کردوویت داوەریی بکـە لـە نێوانیاندا، هەرگیز شوێن داخوازی و ئارەزووی ناڕەوای ئـەوان مەکـەوە و لەو حەقە لامەدە کە پێت ڕاگەیەندراوە، ئێمە بـۆ هەرلایـەکتان بەرنامـە و پرۆگرامی تایبەتیمان داڕشتووە، خۆ ئەگەر خوای گەورە بیویسـتایە هـەر هەمووتانی بەناچاری دەکـردە یـەك ئوممـەتی یـەك پارچـە، بـەڵام خـوای گەورە ویستی وایە: کـە ئـازاد بـن و بـەو ئازادییـە تاقیتـان بکاتـەوە لـەو شتانەی کە پێی بەخشیون (لە تەورات و ئینجیلدا باسی سیفاتی پێغەمبەر ﷺ و ئوممــەتی هــاتووە و داوایــان لێکــراوە هــەرکاتێك خــوای گــەورە ڕەوانەی کرد ئەوان واتە جوولەکە و مەسیحییەکان ببنە پشـتیوانی) دەی کەواتە زۆر بەپەلە پێشبڕکێ بکەن لە چاکە و چاکەکاریدا، دڵنیابن کە هەر هەمووتان دەبێ بگەڕێنەوە بۆ لای خوا، ئەوکاتە هەواڵی تەواوتان دەداتێ دەربارەی هەموو ئەو شتانەی کە ئێوە کێشـە و ڕای جیاوازتـان لەسـەری هەبوو}، ئەمەش ئاگادارمـان دەکاتـەوە بـە پێویسـتبوونی خوێندنـەوەی شەریعەتی ئایینیەکان لەسەر شێوەی بەرامبەرکردن کە پەیوەست بێت بە بارودۆخ و قۆناغەکانی ژیانی مرۆڤایەتی و بە پلەبەندی گوتاری خوایی لـە حاڵەتە خێزانیەکەوە تا دەگاتە حاڵەتی گەل، پاشـان حاڵـەتی ئوممـەت و حاڵـەتێکی تـریش، حاڵـەتی گوتـاری جیهـانی کـە ئاڕاسـتەیە بـۆ هـەموو

مرۆڤایەتی، کاتێك کە لێدەبینەوە و دەگەینە ئەم کۆتا گوتارە جیهانیە، دەبینین گوتارێکە پشت دەبەستێت بە شەرعیەتدان بە ئاسانکاری و بەزەیی بۆ هەموو مرۆڤایەتی، شەریعەتێکە هەڵوەشێنەرەوەی هەموو شەریعەتە قورس و زەحمەت و کۆتوبەندەکانی پێشووە، بۆ ئەوەی (ئەم شەریعەتە) بتوانێت هەموو جیهان لەخۆی بگرێت لەچوارچێوەی بوونی کەمترین هاوبەش لە بەهاو چەمکەکان کە گونجاوبێت بۆ جێبەجێکردن: ﴿الَّذِينَ يَتَّبِعُونَ الرَّسُولَ النَّبِيَّ الأُمِّيَّ الَّذِي يَجِدُونَهُ مَكْتُوبًا عِندَهُمْ فِي التَّوْرَاةِ وَالإِنْجِيلِ يَأْمُرُهُم بِالْمَعْرُوفِ وَيَنْهَاهُمْ عَنِ الْمُنكَرِ وَيُحِلُّ لَهُمُ الطَّيِّبَاتِ وَيُحَرِّمُ عَلَيْهِمُ الْخَبَآئِثَ وَيَضَعُ عَنْهُمْ إِصْرَهُمْ وَالأَغْلاَلَ الَّتِي كَانَتْ عَلَيْهِمْ فَالَّذِينَ آمَنُواْ بِهِ وَعَزَّرُوهُ وَنَصَرُوهُ وَاتَّبَعُواْ النُّورَ الَّذِيَ أُنزِلَ مَعَهُ أُوْلَئِكَ هُمُ الْمُفْلِحُونَ﴾ (الاعراف: ١٥٧) واتە: {هەروەها ئەوانەی کە لە ئایندەدا باوەڕ دەکەن بە پێغەمبەر و فروستادەی نەخوێندەوارمان (محمد)، جوولەکە و مەسیحیەکانیش ناونیشانەکانی دەبینن کە تۆمارکراوە لە تەورات و ئینجیلدا (لەگەڵ دەستکارییکردنیشیدا) کە هەندێ سیفاتی ئەوەیە: فەرمانیان پێدەدات بە چاکە و چاکەکاری، هەرچی شتێکی چاك و پاك و بەسوودە، بۆیان حەڵاڵ دەکات، هەرچی شتێکی پیس و خراپ و ناپوختە لێیان حەرام دەکات، ئەرکە قورس و سەنگینەکان لەسەرشانیان لادەبات، ئەو کۆت و زنجیرانەش کە لە گەردنیاندا بوو لای دەبات، جا ئەوانەی باوەڕی پێ دەکەن و پشتیوانی ئاین و بەرنامەکەی دەکەن و شوێنی ئەو نوورە دەکەون (کە قورئانە) و بۆ ئەو نازڵ کراوە، هەر هەموو ئەوانە سەرفراز و ڕزگار و سەرکەوتوون لە هەردوو جیهاندا}.

کەواتە دەبێت هەست بەوە بکەین ئێمە لە بازنەی ئیسلامیدا لەبەردەم گوتارێکی خواییداین، پلە بە پلـە هـەنگاو دەنێـت تـا هـەموو مرۆڤایـەتی بگرێتەوە، هەربۆیـە ناکرێـت چـەمکی "حـوکمڕانی" بگەڕێنینـەوە تـاوەك شێوەی شەریعەتەکانی پێش خۆمانی لێبکەین، چونکە تێگەیشتنی باو بۆ "حوکمڕانی" لەم سەردەمەی خۆماندا و لەچوارچێوەی ئەو پاشخانەی کە باسمانکرد، خۆی دەنوێنێت لە کردەی لەکارخستنی ئەو چـەمکانەلەدوای زاڵبوونی دیدی رۆژئـاوایی و ئـەو دیـدەی پەیوەسـت بـوو بـە دەسـەڵات و شەرعیەت و شـەرعیەتپێدان و دروسـتکردنی دەوڵـەتی نەتـەوەیی لەسـەر هــەمان دیــدی رۆژئــاوایی، هــەروەها زاڵبــوونی دەوڵــەتی نەتــەوەیی لەچوارچێوەی ئەو ئایەتە قورئانیانەی کە داڕنرابوون لە ناوەرۆك و قـاڵبی خۆیــان و لەشــێوازی وردبوونــەوە لێــی لەچوارچــێوەی (یەکبوونــە بنیاتنەرەکانی قورئانی پیرۆز)دا، هـەروەها لـە چوارچـێوەی لێکدانـەوەی جیهـانیبوونی گوتـار و کۆتـایی هـاتنی پێغەمبەرایـەتی و دەسـەڵاتدارێتی کتێبـی خـوادا، لـە کـاتی باسـکردنمان بـۆ ئـەم بابەتـە لـەنێو شـێوازە تەشریعیەکەیدا، بینیمان حوکمڕانی قورئان شـتێکی تـری جیاوازمـان لـەم بابەتــەدا دەداتــێ. ئــەوەتا لــە "حــوکمڕانی قورئانــدا" دەردەکــەوێت بەرپرسیارێتی مرۆڤـەکان لـە خوێندنـەوە و تێگەیشـتن و جێبـەجێکردن و دابەزانـدن لەسـەر واقیعـدا روون و ئاشـکرایە، هـەروەها لـە "حـوکمڕانی خوایی" رەهادا دەردەکـەوێت مـرۆڤ لێـرەدا تـەنها وەرگـرە، لەسـەریەتی هەرچی پێی دەدرێت بەتوونـدی وەریبگرێـت، ئەگـەر دوودڵـی تێـدا کـرد،

یاخود دواکەوت ئەوا شاخەکە وەك هەور بەسەریدا دەهەژێت، یـان ناچـار دەکرێت بەهەر هۆکارێکی تر قەبوڵی بکات.

لەسـایەی "حـوکمڕانی خـوایی" رەهـادا کـە لـەناو جوولەکەکانـدا لـە سەردەمی "مووسا"دا (سەلامی خوای لەسەر) بەربڵاوبوو، خـوای گـەورە دەسەڵاتی سەرزەوی دابوویە دەست خاوەن سەربازەکان، مەملەکـەتێکی پێکـەوەنا، هـەروەها راسـتەوخۆ بـاڵی کێشـابوو بەسـەر گشـت رواڵەتـە سروشـتیەکاندا، بەتـەواوی لـەدەرەوەی یاسـا سروشـتیەکان، بـەڵام لـە "حوکمڕانی قورئانیدا" کارەکە بەو شـێوەیە نییـە، بـەڵکو ئـەو کتێبێکـی دابەزێنراوە کە هەموو بەها گشتییە هاوبەشەکان لەخۆدەگرێت، پێویسـتە لەسەر مرۆڤ چـاك بزانێـت بیخوێنێتـەوە، موتـاڵای بکـات و بیرکردنـەوە و تێڕامانی بۆی هەبێت لێی تێبگات و پاشان جێبەجێی بکات.

کەواتە حوکمڕانی لێرەدا (حـوکمڕانی قورئـان)، وا دەکـات حـوکمڕانی بەجۆرێك هاوشێوەبێت لەگەڵ رۆڵـی هاوبەشـی نێـوان کتێبـە خواییەکـە و خوێنەرەکانی لە رەگەزی مرۆڤ، کە هەر یـەکێکیان رۆڵـی خـۆی هەیـە لـە هۆشیارکردنەوەی مرۆڤ و توانا هۆشیاریەکەیدا.

"ئەوەی بەهۆی قورئانەوە نەتوانرێت لاببرێت خـوای گـەورەی بـەهۆی دەسەڵاتەوە لایدەبات"، لەبەر ئەوە هەردەبێت قورئان بخوێنرێتەوە، وەك ئەوەی حوکمڕانی کردنەکە حوکمڕانی مرۆڤـەکان بێـت و لـە چوارچـێوەی خوێندنەوەیـەکی رەهـای کتێبـە خواییەکـەدا گـوزەر بکـات و مرۆڤـە جێنشینەکەیش رێنماییەکان جێبەجێ دەکات، ئیتر هەر قاڵبێکی ژیـاری و

هەر شێوازێکی ڕۆشنبیری و هەر بوارێکی مەعریفی هەبێت، پاشان کاتێك تێگەیشتن بۆ حوکمڕانی لەچوارچێوەی پلەبەندیە مێژووییەکەدا بێت (لە حاڵەتی حوکمڕانی خوایی ڕەها لای جوولەکە، بۆ حاڵەتی حوکمڕانی جێنشینی لەلایەن هەندێك لە پێغەمبەرەکانیانەوە، پاشان بۆ دەسەڵاتی پاشایەتی، تا دەگاتە حوکمڕانی کتێبی خوایی کە مرۆڤەکان دەیخوێننەوە و ڕێنوێنیەکانی جێبەجێ دەکەن)، ئەمەش یارمەتیدەرە بۆ ڕامالینی ئەو تەمومژ و ئەو ناڕوونییەی کە زۆرجار لە ململانێ و بەرەنگاربوونەوەکاندا بووەتە یارمەتیدەر، بەهەمانشێوەش بووەتە پاڵپشت سەبارەت بەکرداری تێکشکاندنی هاوبەش، ئەگەر دیدی ئیسلامیمان بیتوانیایە ئەم دەلاقەیەی بکردایەتەوە – ئەگەر خوای گەورە بیەوێت – نابێتە دیدێکی چەقبەستوو کە لە واقیعە مێژووییەکەدا بسوڕێتەوە و بێ توانابێت لە ئاست چارەسەرکردنی کێشەکان کە هەندێکیان پەیوەندی بە چەمکە تەشریعیەکان و واتاکانی دەسەڵات و کۆمەڵگا و پەیوەندیەکانی دەقە قورئانیەکان بە گۆڕانکاریە کۆمەڵایەتی و مێژووییەکانەوە هەیە، هەروەها پەیوەندی بە چەمکە ڕەهاکان لە قورئانی پیرۆزدا و چەمکی گۆڕان و کۆمەڵە و گەل و تەقلید و شوێنکەوتەیی و نوێگەری و نوێبوونەوەوە هەیە.

بناغە لەسەر ئەمە، دووبارە خوێندنەوەی دەقە قورئانیەکان لە چوارچێوەی ئەم تێگەشتنەدا زۆرێك لەو کێشانە چارەسەرەکانیان دەخاتە بەردەممان کە ئێستا هەست بە نەتوانینی چارەسەر و تیمارکردنیان دەکەین، موسڵمانی هاوچەرخ دەتوانێت هەست بە

بەرپرسیارێتی ئەمانەت و ئاستەنگەکان بکات کە دەدرێنە پاڵ ئەو مرۆڤانەی توانای خوێندنەوە و تێفکرین و وردبوونەوەیان هەیە بەناوی ئەو خودایەی کە دروستی کردین و رێزی گرتین و فێری قەڵەمی کردین، مرۆڤەکانی فێری ئەو شتانە کرد کە نەیاندەزانی، تا هەستن بە ئاوەدانکردنەوە و خواستی خوای کاردروست بۆ دروستکراوەکانی دەستەبەر بکات.

## شەشەم: بەرەو دووبارە دارشتنەوەی عەقڵی موسڵمان لە پرسی حوکمڕانیدا

لەوەی پێشەوە بۆمان دەردەکەوێت "حوکمڕانی" شەریعەتەکانی پێش ئیمەشی گرتۆتەوە، ئەگەر بمانەوێت لە هاوکێشەیەکی نوێتردا دایبرێژینەوە بەم شێوەیەی لێدێت: خوا ⟵ پێغەمبەر (مووسا)، یان پێغەمبەری جێنشین (داود)، یان پێغەمبەری موڵکدار (طالوت) ⟵ گەل. ئەم جۆرە پلەبەندی کردنە ئاماژەیە بۆ نەبوونی رۆڵی گەل، لەو پەیوەندیەی نێوان خوای گەورە و پێغەمبەردا – ئەمەش رەچاوکراوە لە هەموو حاڵەتەکانی پێغەمبەرایەتیدا– یان لەنێوان شەریعەت و کارپێکردنی لە ژیانی رۆژانەدا – خۆ پێغەمبەر رۆڵی نێوەندگیری دووسەرە دەبینی لەنێوان خوا و بەندەکاندا و لەنێوان شەریعەت و دابەزاندنی لەسەر زەمینەی واقیعەکەدا، کە جێگای ئیجتیهادکردنی تێدا نابێتەوە–.

بەڵام حوکمڕانی لە حاڵەتی کۆتا پەیامدا و لە پاش بەرزبوونەوەی گیانی پێغەمبەر ﷺ بۆ لای خوای بەرز و بڵند بەم شێوەیەی خوارەوە دەبێت: کتێب (قورئانی پیرۆز) ⟵ فەرمانڕەوا ⟵ گەل، لێرەدا چونکە هیچ نێوەندگیرێکی پارێزراو لەهەڵە و تاوان (مەعصوم) نییە لە نێوان قورئان و فەرمانڕەوادا (بەلانی کەم لە دیدی ئەهلی سوننەوە)، یاخود لەنێوان فەرمانڕەوا و خەڵکدا، بۆیە دوو بۆشایی دەبینین پێویستە لەسەر گەل پڕیان بکاتەوە.

## ١- رۆڵی گەل لە پەیوەندی نێوان کتێب "قورئان" و دەسەڵاتداردا :

پێویستە پێش ئەوەی بڕۆینە درێژەی ئەم بوارە جەخت لە راستیەك بکەینەوە، ئەویش ئەوەیە – ئێستا – لەسەر ئەم ئەستێرەیە کە زەویە هیچ کەس مەعصوم نییە، ئەمەش بەپێویستگیراوە هەموو موسڵمانان بگرێتەوە، ئەمەش ئەوەی لەسەر بینا دەکرێت کە هیچ کەسایەتیەکی سروشتی یان مەعنەوی بۆی نییە قۆرخی دیدێکی حەقیقەتی رەها بۆ کۆتا پەیام بکات، دەرەنجامی ئەمەش :

أ– قورئانی پیرۆز لە نێو هەموو موسڵماناندا بڵاوبۆتەوە، هیچ تاقمێکیان بۆی نییە بانگەشەی ئەوە بکات کە تەنها دیدی دروست بۆ قورئان لای ئەوە، بەهیچ شێوەیەکیش بۆی نییە تاقمەکانی تر ناچاری پابەندبوون بکات لەسەر مەزهەبێکی فیقهی یان عەقیدەیی، قورئان دەقێکی پارێزراو و مەعصومە، بەهەمانشێوە پێغەمبەریش ﷺ مەعصومە، بەڵام کەسەکان

کاتێك لەگەڵ دەقەکاندا هەڵسوکەوت دەکەن مەعصوم نین، ئیتر ئەوانە کەسانی سێ سەدەکەی سەرەتا بن یان نا، زۆرێك هۆکاری تریش هەن کارەکتەرن بۆ تێگەیشتن لە دەقەکان، بۆیە مەعصومبوونی دەق، یان گوتار پاشەکشە ناکات لەسەر جۆری تێگەیشتن لای ئەوانەی کاری لەسەر دەکەن، یاخود لەسەر ئیجتیهاد و بۆچوونەکانیان، ئیتر بە تەفسیرکردن بێت، یان تەئویلکردن، یان هەڵێنجان، یان فیقهـ، بەڵام جۆری تێگەیشتنی ئەوان بە تێگەیشتنێکی مرۆیی دیاریکراو دەمێنێتەوە، تێکەڵ لەگەڵ هۆکارە کەموکورتە مرۆییەکاندا.

ب- قورئانی پیرۆز بڵاوەیکردووە لەنێو زانا موسڵمانەکاندا، ئەوانەی کە کەرەستەی هەڵێنجانیان پێیە، ئیتر سەر بە هەر گرووپێك بن، بۆ هیچ زانا و دەزگایەکی زانستی نییە بانگەشەی قۆرخکردنی حەقیقەت بۆ خۆی بکات، بەتایبەت یەکێك لە ئامانجە بنەڕەتیەکانی قورئانی پیرۆز بریتیە لە بڵاوکردنەوەی هۆشیاری و مەعریفە بە قورئانی پیرۆز، قورئان بۆیە ئاسانکراوە تا ببێتە وەبیرهێنەرەوە ﴿وَلَقَدْ يَسَّرْنَا الْقُرْآنَ لِلذِّكْرِ فَهَلْ مِن مُّدَّكِرٍ﴾ (القمر: ١٧) واتە: {جا ئیتر ئێمە ئەم قورئانەمان ئاسانکردووە بۆ تێگەیشتن و تێڕامان و پەند و ئامۆژگاری وەرگرتن، باشە ئایا خەڵکانێك هەن کە دەرکی حەقیقەت و ڕاستیەکان بکەن؟! پەند و ئامۆژگاری وەربگرن؟!}، ڕۆژانە پێنج جار بەهۆی قورئانەوە خواپەرستی ئەنجام دەدرێت، لەنێو قورئاندا کاهینایەتی و ئیکلیریوسی نییە کە ناسراوە بە -بوونی دەسەڵاتی تایبەت، یان نێوەندگیر لەگەڵ خواوەند- کە گوایە ئەوان شتانێك دەزانن خەڵکە گشتیەکە توانای زانینیان نییە، ئەم بۆنەیە

**بـەگونجاو دەزانم بـۆ ئاڕاسـتەكردنی ڕەخنـە لـە بۆچـوون دەربـارەی "كۆدەنگی"، بەڵام لە ڕوانگەیەكی نوێوە جگە لەو ڕێچكەیەی كـە "ئـەبو عەباس ئیبن تەیمیە" لـە كتـێبی "المنهـاج"دا گرتویەتیـە بـەر، هـەروەها "ئـەبو محەمـەد ئـیبن حـەزم" لـە كتێبـی "الإحكـام"، دەبیـنین چـەمكی "كۆدەنگی" ڕۆحێكی عەلمانیانە خۆی تیادا حەشارداوە، ئەمەی كۆتـایی – بەجۆرێك لە جۆرەكان– خەڵكان خۆیان دەبنـە مەرجەعیـەتی خۆیـان، سـەرەنجام ناگەڕێنـەوە بـۆ شـتێكی جیـاوازتر (سـرووش)، بـەدیاریكراوی ئەمـەش دەرەنجـامی ئەوەیـە خـەڵك ئـەم چـەمكەی لەبەرچـاو گرتـووە و ڕاسـتیش بــە پیاوەكانــەوە دەناسـرێتەوە نــەك پێچــەوانەكەی، لەگـەڵ ئەوەشـدا قورئـانی پـیرۆز (هەنـدێك كـەس هــەوڵیان دا بــەزۆرداری و زۆر لـەخۆكردن تـەئویلی هەنـدێك لـە ئایەتـەكانی بكـەن بـۆ شـەرعیەتدان بـە كۆدەنگی)[1] جەخت دەكاتەوە ڕاستی لەخۆیدا هەر ڕاسـتیە نـەك بـەوەی خـەڵك كـۆبن لەسـەری، ئەمانـەش – هەمیشـە – هەرچـەند سـووربیت لەسەری، ئەوانە باوەڕدار نـین، زۆربـەیان باوەڕنـاهێنن بـە خـوا و ئەوانـە هاوەڵدانەرن بۆ خوای گەورە !**

[1] بڕوانە گفتوگوی فەخری رازی بۆ ئایەتی: ﴿**وَمَن يُشَاقِقِ الرَّسُولَ مِن بَعْدِ مَا تَبَيَّنَ لَهُ الْهُدَى وَيَتَّبِعْ غَيْرَ سَبِيلِ الْمُؤْمِنِينَ نُوَلِّهِ مَا تَوَلَّى وَنُصْلِهِ جَهَنَّمَ وَسَاءَتْ مَصِيرًا**﴾ النسـاء/١١٥، گفتوگۆكـەی بەڵگەهێنانەوەیە بەم ئایەتە لەسەر دروستی (كۆدەنگی– إجماع) گفتوگۆیەكی بەسوودە.

– الرازی، فخرالدین. المحصول في علم أصول الفقه، تحقیق: طه العلواني، بیروت: مؤسسـة الرسـالة، ١٩٩٢م، ج٤، ص٣٥–٦٦.

لێرەدا پرسیارێك دەوروژێنرێت: ئایا نووسەری ئەم دێڕانە مزگێنی بەخشە بەکام یەکێك لەمانە ڕێژەیی بوون یان سەراپای گشتگیری، یان ئەوەی دەکەوێتە دوای نوێگەری؟ وەڵامەکەش: نەخێر، ئێمە داوای بەناوەندکردنی قورئانی پیرۆز دەکەین، ئەوەی دەکەوێتە دوای نوێگەریەوە لەبنەڕەتدا باوەڕی بە ناوەندبوون نییە، ئێمەش باوەڕمان وایە قورئانی پیرۆز کتێبی خوایە و لە ناوەرۆکیدا حەقیقەتی ڕەهای لەخۆگرتووە، سەراپای گشتگیریش دەڵێت حەقیقەت ڕەها نییە، ئەوەی دەکەوێتە دوای نوێگەری وادەبینێ هەموو گێڕانەوە گەورەکانیش کە دەیانەوێت تەفسیری جیهان بکەن داڕماون و کۆتاییان هاتووە، ئێمەش وادەبینین قورئانی پیرۆز کتێبی پارێزراوی خوای گەورەیە و لە هیچ شتێکدا زیادەڕۆیی تێدا نەکراوە و توانای تەفسیر و گۆڕان و وەڵامدانەوەی هەڕەشەکانی هەیە.

بەم شێوەیە، ئێمە تێڕوانین بۆ "پاش کلتوور" دەکەین، پێشوەخت دەڵێین ئەوەی دوای کلتوور دێت مانای ئەوە نییە "دژی کلتوور بێت"، ئەمەیش هەروەك حاڵەتی پاش نوێگەری ( POST- MODERNISM) وایە کە بە مانای (END OF OR ANTI – MODERNISM) دێت. پاشانیش، بانگەوازی ئێمە لەسەر بە ناوەندبوونی قورئانی پیرۆزە (بەبێ هیچ دوودڵییەك لە زاراوەی ئێمەدا قورئان ناچێتە چوارچێوەی کلتوورەوە) بەشێوەیەك بەهۆی قورئانەوە دەڕوانینە کلتوور، نەك بە پێچەوانەوە، بەهەمانشێوە دەبێت هەموو کلتوور لەخوار قورئانەوە بێت بەهیچ شێوەیەکیش لەیەك ئاستدا لەگەڵیدا ناوەستێت، ئەوەی دوای کلتوور دێت

بەهەمانشێوە واتە روانین بۆ پێش کلتوور بە چاوی رەخنە و خوێندنـەوە و کۆتایی پێهێنانیان هاورێ لەگەڵ قورئانی پیرۆز کردنە پێوەر.

ت- لەراستیدا دروست نییە هیچ سیستمێکی سیاسی ببێتە دەزگایەکی پەیوەنیـدار بـە تەفسـیرکردنی قورئـانی پـیرۆز، یـان روونکـەرەوەی حوکمەکانی، ئیتر ئەو دەزگایە دەزگایەکی قەزایی تەکنۆکرات بێت، یاخود دەزگایەکی ئایینی فیقهی بێـت، دەسـەڵاتی تەفسـیرکردن و تـەئویلکردنی هەبێت لە پرسە پەیوەنددارەکان بە شەریعەتەوە.

## ٢- شێوازی پەیوەندی نێوان دەسەڵاتدار و هاووڵاتیان:

### أ- خیلافەتی ئیسلامی:

لە مێژووی ئیسلامییدا هیچ کات نەبووە خەلیفـە دەوڵـەتێکی ناوەنـدی تۆکمە (هوبز)ی بێقڕەی بەڕێوە بردبێت، بەڵکو خیلافەت – لـە سـایەیدا- چەندین بەرزبوونەوە و نزمبوونەوەی بەخۆوە بینیوە، ئەوەش وایکردووە لە زانایـانی بـواری سیاسـەتی شـەرعیی -خـوا گۆڕیـان پـڕ نـوور بکـات- جیاوازی لەنێوان ئیمارەتی شیاو و ئیمارەتی سەپێنراودا بکەن، یەکەمیان خەلیفە ئـەو کەسـەی بەلایـەوە شـیاوبێت بـۆ شـوێنەکە دیـاریی دەکـات، دووەمیـان خەلیفـە بڕیـاری لەسـەر دەدات و دیـاری ناکـات، ئەمـەش وایکردووە مشتومڕ لە پرسی بوونی چەند خەلیفەیەك لە یەك کاتدا بکەن، واتـە دروسـتە یـان دروسـت نییـە موسـڵمانان خەلیفەیـەك یـان زیاتریـان هەبێت، لەمەدا رای جیاوازیان هەبووە، هەیانە وتوویەتی رێگەپێدراو نییە،

چونکه دژی ئەم ئایەتەی خوای باڵادەستە: (وَاعْتَصِمُواْ بِحَبْلِ اللّهِ جَمِيعاً وَلاَ تَفَرَّقُواْ)، هەشیانە وتوویەتی رێگا پێدراوە، چونکە چاکترین کەس کە تێگەیشتبێت لە قورئانی پیرۆز هاوەڵە راستەکانی پێغەمبەرن ﷺ، کاتێك مەدینەییەکان لە (سەقیفەی بەنی ساعیدە) وتیان بە موسڵمانەکانی مەککە: "با یەکێك لە ئێمە و یەکێکیش لە ئێوە ئەمیر بێت"، ئەمەش ئەوە دەگەیەنێت رێگەپێدراوبێت.

لە فیقهی سیاسی ئیسلامیدا، وەك ئەرك، دەسەڵات حوکمی واجببوونی هەیە، هەروەها بە خوێندنەوەی بۆچوونەکانی فیقهی ئیسلامی بۆ دەسەڵات، دەبینین بۆچوونەکان لێك نزیکییان هەیە کە تیایدا دەوڵەت بەهاوتای سیاسەت هەژمار دەکرێت وەك لای (هیگڵ)، یان ئەو بونیادەیە کە هەوڵدەدات چین و توێژەکان لێك نزیك بکاتەوە وەك بۆچونی (فیبر)، ئەوەش بۆچوونێکە تەواو پێچەوانەیە لەگەڵ تێڕوانینی مارکسیدا کە ئەو دەوڵەت لەوەدا دەبینێت دەرەنجامێکە بۆ زاڵبوونی چینێك بەسەر چینێکی تردا (مارکس)، ئەمەش ڕوبەڕووبوونەوەیەکی زۆر سەختە لەگەڵ تێڕوانینی دەسەڵاتنەخوازی کلاسیکی (باکونین).

ئەوەی لە مێژەوە ناوی "دەوڵەتی خیلافەت"ی لێنراوە، دەکرێت پێناسەی بکەین بەوەی بونیادێکە گەلێك لەخۆ دەگرێت و دەسەڵاتێك حوکمی دەکات بەڕەوادانان و بەکارهێنانی توندوتیژی قۆرخکردوە بۆ خۆی، هیچ وابەستەیەکی روونیش نییە پەیوەستی بکات بە پارچەیەکی جوگرافی دیاریکراوەوە، ئەمەش بونیادێکە بەشێوەیەکی ئاشکرا

پێچەوانەیە لەگەڵ چەمکی دەوڵەتی نوێ لە ئێستادا بەوپێیـەی دەوڵـەت پێناسە دەکرێت بەوەی دامەزرێت لەسەر پارچەیەکی جوگرافی دیاریکراو، لە زەوی و ئاسمان و دەریا و قابیلی زیادکردن نییە، بـەڵام ئـەم بونیـادە وادیارە پایەکانی لە ئێستادا ڕووبەڕووبوونەوەی دەبێت لەگـەڵمان، دیـارە ئــەمیش نموونەیــەکی هاوشــێوەی دەوروبەرەکەیــەتی، چــونکە هــەموو ئیمپراتۆرەکان فراوانخـواز بـوون و قـابیلی زیـادکردن بـوون و هەنـدێکیان داویانە بەســەر هەنـدێکی تریانـدا، دەکرێـت فراوانخـوازی –لـە خیلافـەتی ئیسـلامیدا یـان لـە ئیمپراتۆریەتـەکانی تـردا– بـە پاڵنـەری ئـابووری یـان ئایینی (جەنگەکانی خاچپەرستان) یان پاڵنـەری رامیـاری (سـەرقاڵکردنی سەربازەکان تا هەڵنەسن بە کودەتای سەربازی، یان لـە حاڵـەتی ئـەوەی ئەگەر هەڵنەسم بە فراوانخوازی ئەوا فراوانخوازیم لەسەر ئەکرێت) بووبێت.

بە گوزەرکردنێـك بـە مێـژووی ئیسـلامی و واقیعـی جیهـانی هاوچـەرخدا، دەردەکەوێت مەرکەزییەت سەردەکێشێت بۆ دەسـەڵاتخوازی و ئۆتـۆکراتی و زۆرداری و پەکخســتنی بەرژەوەندییــەکانی خــەڵك، زیــادکردنی بیرۆکراتــی، ئەمانــەش هــەمووی لـە مەبەسـتەکانی قورئـان نـین و ئـاوەدانی دەسـتەبەر ناکات، بەڵکو بوونیشی ئەستەم دەکات، مەگـەر لـەژیانی خـەڵکانێکی تـەواو دەربازبوو لە کۆتوبەندی دەسـەڵات. بۆیـە، ئێمـە تێڕوانینـی مێژووییانـە بـۆ خیلافـــەتی ئیســـلامی رەت دەکەینـــەوە، بەهەمانشـــێوە شـــێوازە جۆراوجۆرەکانی نوێگەری وەك کۆنفیدراڵی (سەنهوری) یاخود کۆمۆنویڵسـی (مالك بن نبی)، کەواتە بوونی یەك جۆر رۆشنبیری بۆ گەل دەبێتە بنەڕەت و ڕاگر، دروستیش نییە دەسەڵاتخوازی بکرێتە یەکێك لە دیاریکەرەکانی.

## ب – دەوڵەتی نوێ :

لـە پێناسـەکەیەوە دەردەکـەوێت لەسـەر سـێ پێکهاتـە دادەمـەزرێت: گـەل، هـەرێم، دەسـەڵات، پێکهاتـەی یەکـەم (گـەل)، کـە لەبنەڕەتـدا پێکهاتەیەکی رامیارییە (بەپێچەوانەی پێکهاتـەی ئوممـەت کـە بریتیـە لـە پێکهاتە و چەمکێکی رۆشنبیری)، کە مەرج نییـە یـەك رەگـەز، یـان یـەك جـۆر رۆشـنبیری هـەبێت، بـەڵکو لـەڕێی کـرداری گۆڕینـەوەی رۆشنبیرییەکانەوە پێکدێت، کە لەنێوان هەموو ئەو خەڵکانـەی ناسـنامەی ئایینی و نموونە مەعریفیەکانیان جیـاوازە، ئێسـتا خەڵکـە موسـڵمانانەکە لەچوارچـێوەی ئـەو دەوڵەتـەدا دەژیـن و بـەگوێرەی بنـەمای هاونیشتمانیبوون مافەکانیان دەستەبەر دەکات و هاووڵاتی ئـەو دەوڵەتـە پابەنـد دەکـات ئـەرکی سەرشـانیان بەرامبـەر بـەبێ ئاوڕدانـەوە بـۆ هـیچ پاشخانێکی رۆشنبیری، بەو پێیەی هاووڵاتیەکە وابەستەیە بەدەسەڵاتەوە و لەبنەڕەتدا باج دەداتە دەوڵەت، ئەمەش کارێکە خاڵیکراوەتەوە لـەوەی کە تەنها بەهایەك بێت.

لێرەدا دەکرێـت چارەسـەر لەبـەردەم خەڵکـە موسـڵمانەکە، یـان هـەر یەکێك لە گرووپەکان، بە چەند ئەگەرێك بکرێت، لەژێر دەسەڵاتی دەوڵەتدا دەربچێت و قەوارەیەکی تر بۆخۆی بنیات بنێت، کە تەنها تایبەت بێت بە موسڵمانەکانەوە، یاخود بوارە گشتیەکە پـاوان بکـات و بیخاتـە ژێـر یـەك چەترەوە، یاخود بچێتە نێو پێشبڕکێیەکی ئاشتیانە لەژێر چەتری بـوونی بـوارێکی کـراوەی گشـتی بـۆ هـەموان، ئەگـەری یەکـەم وێنەیەکـە لـە

ئەستەمبوون، دووەمیشیان کردارێکی فاشییانەیە، بەڵام سێهەمیان ئەو ئەگەرەیە کە مەیلمان بۆی هەیە و لەگەڵیدا دەبین.

بەمەش ئێمە ئەو چارەسەرە راستدەکەینەوە کە وەستاوە لەسەر زیاتر بەهێزکردنی پایەکانی یەك خوا پەرستن و دانانی بەوەی ئەو هاوبەشەیە کە کۆمەڵگەی بۆ بانگ دەکەین بۆ دەربازکردنی بەندەکان لە پەرستنی خود، یان پەرستنی ئەو قەوارانەی کە خۆیان دایانهێناون بەرەو پەرستنی خوا بەتەنهایی و بەتاقانەزانینی لە پەرستن و پەروەرش و سیفاتەکانیدا، پاشان بانگەوازکردن بە چاکترینی شێوازەکان و گفتوگۆی هەمیشە و بەردەوام، بۆ زیاتر پتەوکردنی پایە هاوبەشەکان و بەرتەسککردنەوەی پرسە ناکۆکەکان، هاوبەشەکانیش لێرەدا پێویستە بەشێوەیەك سەیر بکرێت کە کارێکی هاوبەشە لەنێوان هەموو پێکهاتە و توێژەکاندا، تا ئەو شتە گرنگ و پێویست و جوانسازیانەی کەسەر بەو قەوارەیەن پارێزراوبن، ئەوەش بەو پێیەی ئەمانەتێکی بەشکراوە بەسەر هەموو گەلدا، کە باشتر وایە سێ دەسەڵاتەکە پێی هەستێت و پارێزگاری لێ بکات و هاوسەنگی لە نێوانیاندا دابنێت و رێگەنەدات بە تێکدانی هیچ بەشێك لە بەشەکانی ئەو ئەمانەتە کە ئەمڕۆ بە هۆکارە دیموکراتیەکان ناسراوە وەك هەڵبژاردن، کەواتە سندوقی هەڵبژاردن پەسەندە لامان هەروەك پێشینەکانمان قورعەیان لا پەسەند بووە، بەو پێیەی هۆکارێك بووە بۆ گەیشتن بە شتێك کە هەموان پێی رازی بن و جیاوازیەکان نەهێڵێت، لەگەڵ لەبەرچاوگرتنمان بۆ ئەو رەخنانەی کە ئاراستەی دیموکراتیەت دەکرێن، کە زۆرێك لە زانایان تێڕوانینیان بۆ کردووە،

زۆبەشیان کەسانی هاوسۆزی چەپەکان بوون، لە وێنەی: نعوم چۆمسکی، سلافوی جیجیك، جاك رانسیر، بۆیە پێویستە لەگەڵ چوونەپێشی دیموکراتیەتدا، دادگەریی کۆمەڵایەتیش بێتەدی و سەرجەم گەلەکان بۆیان هەیە میکانیزمی گونجاوی بۆ دیاریی بکەن، ئیتر لەڕێی نوێنەرایەتی پەرلەمانیی، یان بە دیموکراتیەتی کرێکاری بێت، یان لەڕێی ئەنجومەنەکانەوە، یان هەر میکانیزمێکی تر، تا ئەگەر موسڵمانەکان، یان جگە موسڵمانەکان، توانییان بگەنە هۆکارێکی باشترو کاراتر، یان خاڵی لە هەر دەرهاویشتەیەکی لاوەکی بۆمان هەیە —لەوکاتەدا— ئەو هۆکارە بگرینەبەر، دیارە حیکمەتیش ونبووی باوەڕدارانە.

گەلی موسڵمان گەلێکی لوتکەیە[1]، لەگەڵ ئەوەشدا ناوەندێك نییە پێویست بێت هەموو گەلانی تر بەچواردەوریدا بخولێنەوە، هەروەك چۆن نوێگەری ڕۆژئاوا ئەمەی لەخۆیدا حەشارداوە، بەڵکو گەلێکە کارلێك دەکات لەگەڵ هەموو گەلانی تردا لە کەش و هەوایەکی پڕ لە گفتوگۆ و ڕەنگاو ڕەنگ و فرەییدا.

---

[1] بەدرێژی سەیری بکە لە:

– أبو الفضل، منى، المدخل المنهاجي لدراسة النظم السياسية العربية، قاهرة، دار السلام، ٢٠١٣م، ص٣٢٣ ، ٣٨٧.

## ت – رزگاریکار:

لە هەموو ئیسکاتۆلۆجیەکانەوە (بیروبۆچوونی پاشەڕۆژی) کە تایبەتە بە هەر سێ ئایینە پەیامدارەکە (جوولەکە، مەسیحیی، ئیسلام)، دەتوانین بیرۆکەی "مەهدی چاوەڕوانکراو"، یان مەسیحی رزگاریکار، یان هەردووکیان پێکەوە هەست پێبکەین، لەگەڵ ئەوەشدا ئێمە دەبینین قورئانی پیرۆز ئەم بیرۆکەیە رەتدەکاتەوە و پاڵپشتی ناکات.

لەڕاستیدا نەصرانیەکان لەڕێگای رۆشنبیری زارەکی ئەم بیرۆکەی رزگاریکارەیان گواستۆتەوە، ئەم باوەڕبوونە بە رزگاریکار لەناو جوولەکە و نەصرانیەکاندا تەشەنەی کردووە، پاشتریش لەنێو دوورگەی عەرەبیدا لەپێش هاتنی ئیسلامدا تەشەنەی کردووە ﴿وَكَانُواْ مِن قَبْلُ يَسْتَفْتِحُونَ عَلَى الَّذِينَ كَفَرُواْ﴾ (البقرة: ٨٩) واتە: {..بە مەرجێك پێشتر بەتەمابوون بەم کۆتا ئاینە سەرکەوتن بەدەست بێنن بەسەر کافرو بێ باوەڕاندا..}، جوولەکەکان بە هیوای رزگاریکاری داهاتووەوە خۆیان بە سەرکەوتوو دەزنی، پاشان نەصرانیەکانیش شوێنیان کەوتن ئەوانیش بە رزگاریکاری داهاتوو خۆیان بە سەرکەوتوو دەزانی، کە ئەویش گەورەمان پێغەمبەر مەسیحە، لێرەوە بۆچوونی رزگاریکار هاتە ناو ئێمەیشەوە.

دەڵێم: ئەگەر تەسلیم ببین بە بۆچوونی رزگاریکار، ئەی کۆتایی هاتنی پێغەمبەرایەتی چی لێدێت؟! بۆیە گرووپە سۆفیەکان – لە پێشیشیانەوە شێخ محیی دین ئیبن عەربی– کاتێك هەستی کرد پرسی ویلایەت و ئەوەی وتوویەتی دەربارەی لوتکە و کاریگەر و هەندێ شتی تر لەو

زاراوانە و پێدانی ئەو دەسەڵاتانەی کە دراونەتە صۆفیە توندگیرەکان بۆی ڕاست نابێتەوە، مەگەر دەمێك بکوتێتــە کۆتـایی هـاتنی پێغەمبەرایـەتی، بۆیە وتی: (پێغەمبەرایەتی تەنها لە ڕووی تەشـریعیەوە کۆتـایی هـاتووە، بەڵام هەموو پێکهاتەکانی تری پێغەمبەرایەتی بەردەوامە و بەبـەردەوامی لە وەلیەکەوە بۆ وەلیەکی تر دەگوازرێتەوە تا ڕۆژی دوایـی...) ئەمـە لـە "الفتوحـات المکیـة"دا هەیـە و لـە هەنـدێك لـەو کتـێبی تەفسـیرانەی کـە کاریگەری هەبووە لەسەریان و لێیانەوە گواستراونەتەوە، لەوانە تەفسیری ئالوسی لە سورەتەکانی (النساء ، الإسراء، الکهف، النجم..).

لەلایەکی تریشەوە برا شیعەکانمان .. راسـتتر شـیعەی عەلـەوی، واتـە ئەوانەی پاڵپشتی گەورەمان عەلی کـوڕی ئـەبو تالیبیـان کـرد –خـوا لێـی ڕازی بێت–، ئەوەبوو لە دواییـدا ئـەبو زەڕی غـەفاری و چـەندینی تـر لـە گەورە هاوەڵانی پێغەمبەر وایان دەبینی کە پێشەوا عەلی لەبەر ئەوەی لە گەنجێتیدا و لە کاتی لاوی و پێگەیشتنیدا لە ماڵی پێغەمبـەردا ﷺ بـووە لەوانەبوو ئەو بەتواناتر بووبێت بۆ هەڵگرتنی ئاستەنگەکانی خیلافـەت لـە گەورەمان عوسمان –خوا لێی ڕازی بێت–.. لێـرەدا لایـەنگرانێك هـەبوون بەلایانەوە وابوو کە دەبوو ئەو خەلیفە بوایە، فاتیمـەش –خـوا لێـی ڕازی بێت– بەهەمانشێوە مەیلی بەلای ئەوەدا بـوو، لەکاتێکدا ئـەو هاوسـەری بوو لە ماڵی باوکیشیدا گەورە بوو بوو.

ئەو قسەیەش کە دەوترێت دەربارەی ئەوەی کە هـیچ وابەسـتەبوونێك نییــە لــەنێوان دابــەزینی مەسـیح و کۆتــایی هــاتنی پێغەمبەرایــەتی

پێغەمبـەرمان، چـونکە ریوایەتـەکان پێمـان دەڵـێن یەکـەم شـوێنکەوتەی دووەمە، هەروەك لە دەقی فەرموودەکەدا هاتووە: مەسـیح نوێـژ لـەدوای ئیمامێکی موسڵمانەوە دەکات و ئەو بـە شـەریعەتێکی تـازەوە نایـەت تـا ببێتە نەسخکەرەوەی شەریعەتەکەی پێغەمبەر ﷺ، ئەمە هـەمووی وەك تەئویلکردنێکە، چونکە فەرموودەیان لایە دەفەرموێت مەسیح دادەبەزێتە سەر منارەی سپی لە دیمەشق و لەوێ مەهدی دەدۆزێتەوە لەکاتێکـدا کـە پێشنوێژی بۆ خەڵك دەکـات، کـاتێکیش مەهـدی هەسـت دەکـات —نـازانم چۆن هەست دەکات لەکاتێکدا ئەو نوێژ دەکات و ئیمامە و ئەویش لەدواوە دێت— گەورەمان مەسیح دێـت و لەپشـت میحرابەکـەوە دەبێـت، ئـەویش مەسیح دەباتە پێشەوە، مەسیحیش دەفەرموێت پێـی: (نـا.. پێشـەواتان لـەخۆتان دەبێـت)، نوێـژ لـەدوای مەهدیـەوە دەکـات، پاشـان دەجـال دەکوژێت تا کۆتایی باسەکە.

ئەم فەرموودانە پێویستیان بە راستاندنی قورئانی هەیە، پاشـان دوای راستاندن بوونی هەژموونی قورئانی بەسەریەوە، قورئانی پیرۆزیش کاتێك وەسفی پێغەمبەر ﷺ دەکات بەوەی دەبێتـە شـایەت بەسـەر خەڵکـەوە دوای ئەو تاکەکەسێکی تری دیاری نەکرد ببێتە شایەت بەسەر خەڵکەوە، بەڵکو خوای گـەورە دەفـەرموێت : ﴿لِّتَكُونُواْ شُهَدَاء عَلَى النَّاسِ وَيَكُونَ الرَّسُولُ عَلَيْكُمْ شَهِيدًا﴾ (البقرة: ١٤٣) واتـە: {..تـا ببنـە شـایەت بەسـەر خەڵکیەوە و بۆیان ڕوون بێت (کە ئەم ئاین و بەرنامەیە سـەرتاپای خێـرە بـۆ تـاك و کۆمـەڵ بـۆ گـەل و نیشـتمان، بـۆ دنیـا و قیامـەت، هـەروەها گشتگیرە و هەموو بوارەکانی ژیان ئاڕاستەی خێر دەکـات)، هـەروەها بـۆ

ئەوەش کە پێغەمبەر شایەتی بدات بۆ دڵسۆزانی ئوممەتی لەسەر ئـەوەی کە بەئەرکی سەرشانی خۆیان هەستاون..}، کەواتە شـایەتیەکە سـپێردرا بە گەل، نەك بە تاکە کەسێك، ئەو چاکێتیەی کە وەسفی پێغەمبەری پـێ کرا درا بە گەلەکەی لـەپاش خـۆی، تـا بـوو بـە (چـاکترین ئوممـەتێك بـۆ هیدایـەتی خــەڵکی و خێــری هــەردوو جیهــان)، هــەر بەهەمانشــێوەش میانڕەوی پـێ سپێررا: ﴿وَكَذَلِكَ جَعَلْنَاكُمْ أُمَّةً وَسَطًا﴾ (البقـرة: ١٤٣) واتـە: {..ئا بەوشێوەیە ئێمە ئێوەمان بەگەل و ئوممەتێکی میانڕەو گێـڕاوە لـە هەموو ڕوویەکەوە..}، کەواتە هەر هەوڵێك بۆ دەست بەسەراگرتنی مـافی گـەل یـان ئـەو ئەرکانـەی کـە دراوە بەسـەریاندا، پێویسـتی بـە بەڵگـەی قورئانی هەیە، یان بە فەرموودەی موتەواتەر، یـان نزیـك لـە فـەرموودەی متەواتــەر هەیـە، کـە لـە قورئانـدا بنچـینەیەکی هـەبێت پاڵپشـتی بکـات، ئەگەرنا دەبێتە زەوتکردنی مافی گەل، چونکە لەم بوارەدا فەرمودەی زۆر هەیـە وەك زانایـانی فـەرموودە دەڵـێن دەمانباتـە نـاو ڕێگایـەك کـە پێـی دەوترێـت ڕێگـای "سـابرین"، گـرنگ ئەوەیـە ئێسـتا ئێمـە پێویسـتمان بەوەیە– هۆکاری زۆریشمان لەبەردەستە– کارێکی زیاتر لەسەر سـوننەت بکـەین، بـە پێوەرەکـانی خـودی زانایـانی فـەرموودە بـەبێ ئـەوەی لێـی بترازێین، لەگەڵ پێویستبوونی ڕاستاندنی قورئانی، خوای گەورە کارنامەی ڕاسـتاندنی بـۆ کەلـەپووری هـەموو پێغەمبـەران سـپاردووە بـە قورئـان ﴿مُصَدِّقًا لِّمَا بَيْنَ يَدَيْهِ مِنَ الْكِتَابِ وَمُهَيْمِنًا عَلَيْهِ﴾ (المائـدة: ٤٨) واتـە: {ئێمە ئەم قورئانەمان نازڵکرد بۆ تۆ ئەی محمد ﷺ کە هەموو حەقیقەت و ڕاستیەکانی لە ئامێزگرتووە، بە ڕاستدانەری کتێبەکانی پێش خۆیەتی و

لەوانیش گرنگتر و پایەدارترە﴾، کەلەپووری پێغەمبەریش ﷺ لە قورئان جیاناکرێتەوە، کەواتە ئەو لەپێشترە تا قورئان راستاندنی بۆ بکات و هەژموونی هەبێت بەسەریدا، ئاشکرایشە مەبەستمان لە راستاندنی قورئانی پیرۆز، هەموو ئایین و هەموو ئەوەی کە دابەزێنراوەتە سەر پێغەمبەران، یان پێغەمبەران هێناویانە گەڕاندنەوەیان بۆ حاڵەتی راستاندن و پاشان هەژموونکردن بەسەریاندا.

ئەوەی کە دەمەوێت سەرنجتانی بۆ رابکێشم ئەوەیە، پرسی دابەزینی گەورەمان مەسیح لە قورئانی پیرۆزدا هیچ بەڵگەیەکی لەسەر نییە[١]، پایەکانی باوەڕیشمان هەمووی لە قورئانەوە سەرچاوەی گرتووە: باوەڕ بە خوا و بە فریشتە و بە کتێبەکانی و بە نێردراوەکانی و بە رۆژی دوایی و ئایەتەکانی قەدەریش کە ژمارەیان چل ئایەتە کە دەربارەی تێگەیشتن بەشێوەیەکی راست و دروست لە قەدەر لە قورئانی پیرۆزدا هاتوون.

ئەمانە لەلای ئێمە پایەکانی باوەڕن، باوەڕی ئێمە باوەڕێکی بڕاوە و یەقینیە، ناکرێت بە رێکاری رووکەشانە بچەسپێنرێت، پاشان تەنها یەك مەزهەب هەیە کە بەلایەوە فەرموودەی تاك ئەگەر چەسپاوبێت و پێچەوانە نەبێت لەگەڵ قورئاندا لە بواری بیروباوەڕدا وەردەگیرێت، ئەویش شانزە مەرجی بۆ دانراوە، پاشان دەرگایەکی تریان بۆ کردینەوە کە لێیەوە پرسی مەهدی و گەورەمان مەسیح و چەندین بیروباوەڕی تر کە

---

[١] ئەم بۆچونە یەکێکە لە رایە تایبەتەکانی نوسەر و هەندێك لە بیرمەندانی کۆن و نوێ، گوزارشت ناکات لە بۆچونی سەنتەری زەهاوی و وەرگێڕ. وەرگێڕ

سەرجەمیان دەکاتە زیاتر لە ٣٨٠ جۆر بیروباوەڕ هەروەك لە "طحاوية" و زۆرێك لە کتێبەکانی زانستی کەلامدا هـاتووە، لەکاتێکدا بیروباوەڕمـان — وەك لە قورئانی پیرۆزدا هاتووە— لەو پێـنج پایەیـەی کـە ئاماژەمـان پـێ کرد تێناپەڕێت.

پاشانیش ئەوەی کە قورئانی پیرۆز ئامـاژەی پـێ کـردووە دەربـارەی پرسی گەورەمان عیسی —سـەلامی خـوای لێبێـت— دەبێـت بەتـەواوی لـە چوارچێوەی یەك بونیادی قورئانیەوە لێی تێبگـەین، ئـەوەی کـە قورئـان دەفەرموێت: ﴿إِنِّي مُتَوَفِّيكَ وَرَافِعُكَ إِلَيَّ﴾ (آل عمران: ٥٥) واتـە: {..خـوای گەورە بە عیسای فەرموو: ئـەی عیسـا مـن تـۆ دەمـرێنم، پاشـان بـەرزت دەکەمەوە بۆ لای خۆم..}، بەرزکردنـەوە بـەو مانایـە نییـە کـە ئێمـە لـە هزرمانـدا بـیری لێدەکەینـەوە، بەتایبـەت لـەم پرسـەدا، کـە بەزینـدوویی بەرزکردنەوەیە بۆ ئاسمان، چونکە بەرزکردنەوە لـە قورئـانی پـیرۆزدا بـە واتای تر هاتووە: ﴿يَرْفَعِ اللَّهُ الَّذِينَ آمَنُوا مِنكُمْ وَالَّذِينَ أُوتُوا الْعِلْمَ دَرَجَاتٍ﴾ (المجادلة: ١١) واتە: {خوای گـەورە ئەوانـەی ئیمـان و باوەڕیـان هێنـاوە لەگەڵ ئەوانەدا کە زانست و زانیارییـان پێـدراوە لەلایـەن ئـەو زاتـەوە بـە چەندەها پلەی بەرز ڕێزی تایبەتیان هەیە}، هەروەها دەفەرموێت: ﴿إِلَيْهِ يَصْعَدُ الْكَلِمُ الطَّيِّبُ وَالْعَمَلُ الصَّالِحُ يَرْفَعُهُ﴾ (فـاطر: ١٠) واتـە: {گوفتـاری شیرین و بەجێ و جوان و دروست هەر بۆ لای ئـەو زاتـە بـەرز دەبێتـەوە، کردەوە چاکەکانیش هەر ئەو زاتە خۆی بەرزی دەکاتەوە}، وە ﴿وَرَفَعْنَا لَكَ ذِكْرَكَ﴾ (الشرح: ٤) واتە: {هەروەها مەگەر ناو و ناوبانگی تۆمان بـەرز نەکردۆتەوە}، هەروەها دەفەرموێت: ﴿وَرَفَعْنَاهُ مَكَانًا عَلِيًّا﴾ (مـريم: ٥٧)

واتە: {ئێمە بە هۆی خەبات و تێکۆشـان و لێبڕانیـەوە، پلەوپایـەمان زۆر بەرز و بڵند ڕاگرت و ڕێزی تایبەتیمان بـۆ دانـا} ، کەواتـە ئێمـە لەبـەردەم چەمکێکی قورئانیداین ناوی (الرفع)ە، ئەم چەمکەش بەربڵاوەو لە زۆربەی سورەتەکاندا بوونی هەیە، ئـەوەش ناگەیـەنێت کـە ئاماژەی کردبێـت بـۆ بەرزکردنـــەوەی هەســـتپێکراو.. لێکچـــوواندنی ژیـــان و بەرزکردنـــەوە لێکچوواندنی نەصـرانیەکانە، چـونکە نەصـرانیەکان لـە پرسـی پێغەمبـەر مەسیحدا بوون بە چەند مەزهەبێکەوە، هەیانە دەڵێت: هەڵواسرا و کۆتایی پێهـات، هەشـیانە دەڵێـت: هەڵواسـرا و "مەریـەمی مەجـدەلی" و دایکـی توانیان بەرتیل بدەنە ئەو پاسەوانەی کە پاسەوانی قەبرەکەی دەکـرد تـا بوارێکیـان بـۆ بڕەخسـێنێت بـۆ هەناسـەدان لـەناو قەبرەکـەدا، ئـەوکات کـونێکی لـە قەبرەکـەدا هێشـتەوە تـا هەناسـەی لێـوە بـدات، هـەروەها بـەرتیلێکی تریـان دا تـا پاسـەوانەکان قەبرەکـە بـەجێبهێڵن ئـەوانیش قەبرەکەیان جێهێشت و ڕۆشتن، پاشان مەریەمی مەجدەلی و دایکی هـاتن و پێغەمبەر مەسـیحیان دەرهێنـا و نـانی (فصح)ی لەگـەڵ قوتابیەکانیـدا خوارد کە زۆربەیان لە گوماندا بوون ئەوە مەسیح بێـت، بۆیـە هەنـدێکیان دەسـتیان لێ ئـەدا و هەنـدێکی تریشـیان پرسـیاریان لێ دەکـرد، ئەمـەش بەگوێرەی ئەوەی خۆیان گێڕاویانەتەوە.... پاش ئـەوە لەگـەڵ مەریـەمی مەجدەلی هاوسەرگیری کردوە، چـەندین منـداڵیان خسـتۆتەوە و ژیـانێکی ئاسایی بەسەربردوە، تا بەو شێوەیە وەفاتی کردوە.

هەشیان بووە دەڵێت: لێیان گۆڕاوە و بووەتە هاوشێوەی ئەو کەسەی هـەواڵی لێـدا .. خـوای گـەورە ویسـتی وابـوو سەرشـۆڕی بکـات بـەوەی

چواندیە پێغەمبەر مەسیح و ئەویان کوشت، پێغەمبەر مەسیحیش خۆی دەربازکرد.. لە هەموو حاڵەتەکاندا ئەو رزگاری بوو، جیاوازی نییە ئەگەر گێڕانەوەکەی یەکەمی نەصرانیەکان وەربگرین یاخود گێڕانەوەی کۆتایی، بە ژیانێکی ئاسایی ژیاوە تا وەفاتی کردوە... ئەمە لای نەصرانیەکان، بەڵام لای خۆمان وشەی (الرفع)مان لا تێکەڵ بووە، بەگوێرەی تێگەیشتنی زۆرێك واتە بەرزکراوەتەوە بۆ ئاسمان بە زیندوویی تا جارێکی تر دابەزێتەوە، لەمەشدا دژایەتی هەیە.. چونکە لە هەمان ئایەتدا کە زاراوەی "الرفع"ی تێدا هاتووە دەفەرموێت: (إِنِّي مُتَوَفِّيكَ) من تۆ دەمرێنم، ئەوان سەرقاڵ بوون بە لێچووەکەیەوە، ئەوەبوو هەڵیانواسی و کوشتیان، پێغەمبەر مەسیحیش هەڵهات.. ئیتر بۆچی بە زیندوویی بەرزی دەکاتەوە؟ هیچ شتێك نییە ئەمە پێویست بکات و! چی وادەکات بەرز بکرێتەوە؟ هیچ شتێك... ئەگەر ئەوەش بەرزکردنەوە بێت ئەوا پێچەوانەی "لێچواندنەکەیە"، کەواتە ئەوان هێنایان تا هەڵیواسن و خوایش رزگاری کرد!

ئەوان نەیانتوانی ئەو دژبوونەش بدۆزنەوە کە لەنێوان قسەکانی خۆیان و ئایەتە قورئانیەکاندا هەیە، هەتا لەنێوان خودی ئەو ئایەتەشدا کە بە بەڵگە بۆ لێکچوونەکە دەیانهێنایەوە کە لێیان تێکەڵبووە لەکاتێکدا ئەو رزگاری بووە، هیچ پێویستبوونێك نییە بۆ بەرزکردنەوە بەو واتایەی کە ئەوان لێی تێگەیشتوون، لەهەمانکاتدا ئەو لەبەرچاوی خەڵك نەماوە و لە شوێنێك خۆی حەشارداوە، وتراویشە ئەو لە میسر خۆی حەشارداوە، پاشان ژنی هێناوە و دوو کوڕیشی هەبووە یان کوڕ و کچێك و ژیانێکی

ئاسایی کردووه، چونکه ئەو دوای ڕووداوەکە ئیتر بانگەوازی نەکردووه، دواتریش وەفاتی کردووه.

ئەم دژبوونەش لە گێڕانەوەکانی ئینجیلدا و لە هەندێ فەرموودەی ناو تەفسیرەکانی لای خۆشماندا هەیە، بۆیە پێویستە ئەم دژبوونە چارەسەر بکەین: (مُتَوَفِّيكَ وَرَافِعُكَ إِلَيَّ) بەرزت دەکەینەوە بە ڕۆح، هەموو ڕۆحێکیش بەرز دەکرێتەوە بۆ لای پەروەردگار، هەیانە دەچێتە ناو دۆزەخ، هەیشیانە دەخرێتە ناو بەهەشتی بالاوە ﴿كِتَابٌ مَّرْقُومٌ * يَشْهَدُهُ الْمُقَرَّبُونَ﴾ (المطففين: ٢٠-٢١) واتە: {ئەوە کتێب و سیقی دۆسیەیەکی مۆرکراوو لۆك کراوە زۆر بەجوانی و ڕێکو پێکی هەلگیراوە، ئەو نامەیە فریشتە ڕێزدارەکانی خودای میهرەبان دەیکەنەوە و بەسەرسامی خۆشیەوە سەرنجی کردەوە چاکەکانیان و خواپەرستی و خەبات و جیهادی چاکان دەدەن و شایەتی لەسەر دەدەن}، کەواتە بەرزکردنەوەی لەلایەن خوای بەرز و بالادەستەوە وەك لە ئایەتە پیرۆزەکەدا هاتووە بەرزکردنەوەی ڕۆحیەتی، بەلگەشمان بۆ ئەوە هاتنی زاراوەی "الرفع"ە لە قورئانی پیرۆزدا بەم مانایە، هەمووان بەم شێوازە بەرز دەکرێنەوە: شەهیدان، کردەوەی چاك، شتی تریش... کەواتە پێویستە تێگەیشتن لە وشەی "الرفع" ڕزگار بکەین و ئەو بەشەی وشەی "الرفع" بۆ پێغەمبەر مەسیحیش بخەینە ریزی هەمان واتای پێشوو، بەلام ئایەتەکەی سورەتی الزخروف ﴿وَإِنَّهُ لَعِلْمٌ لِّلسَّاعَةِ فَلَا تَمْتَرُنَّ بِهَا﴾ (الزخرف: ٦١) واتە: {جا لە ڕاستیدا گەڕانەوەی عیسا یەکێکە لە نیشانە گەورەکانی قیامەت، تۆی ئیمانداریش شك و گومانت لەو ڕووداوانە و بەرپابوونی قیامەت نەبێت}

ئەمە گوتارێکە لەلایەن پێغەمبەری خوا (محەمەدی کوڕی عبدالله) وە بۆ خەڵکی، پێیان دەڵێیت ئەو سرووشەی کە خوای گەورە ناردوێتیە سەرم، زانستە دەربارەی ڕۆژی دوایی، چونکە پاش من ئیتر نێردراو و پێغەمبەرێکی تر نایەت و بەڵگەیە لەسەر نزیکی هاتنی ئەو ڕۆژە، کەواتە ئەی خەڵکینە لە خوا بترسن و شوێنم بکەون.. ئیتر چۆن دەتوانرێ کەلێنی ئاینی و ڕۆشنبیری لە گوتارەکەی پێغەمبەرەوە ببێتە بەڵگە لەسەر جیهانیبوونی پەیامی پێغەمبەر مەسیح، کە ئەو پەیامێکی نەتەوەیی تایبەتە بۆ نەوەکانی ئیسرائیل ﴿وَرَسُولاً إِلَى بَنِي إِسْرَائِيلَ﴾.

خۆ ئەگەر ئەم باسەی پێغەمبەر مەسیح و دابەزینەوەی دووبارە و پەیوەستکردنی بە پرسی حوکمڕانیەوە، بانگەشەی ئەوەی کە گوایە بۆ ماوەی هەزار ساڵ حوکمڕانی دەکات و مەهدی چاوەڕوانکراویش ماوەی چەند ساڵێك حوکمڕانی دەکات نەبوایە، ئەوا خۆمان نەئەدا لەقەرەی ئەم باسەی کە تایبەتکراوە بۆ توێژینەوە لە بابەتی حوکمڕانی خوایی.

# کۆتایی

ئەم چەند ساڵە کەمەی رابردوو، تیایدا چەمکی (حوکمڕانی خوایی) لەلایەن چەندین قوتابخانەی فیکری جۆراوجۆرەوە دەست بۆبردنی بەخۆوە بینی، هەندێکیان لەو سۆنگەوە باسیان لەم چەمکە کردووە هەروەك ئەوەی چۆن دەست دەبەیت بۆ هۆنراوەیەك، بەجۆرێك کە ئەوەندە بەس بێت شیتەڵی بکەیت و پاشان وشەکان ریز بکەیتەوە تا ماناکەی دەردەکەوێت، هەندێکی تریشیان بەجۆرێك باس و خواسی لێوەکردووە بەو پێیەی یەکێکە لە گرنگترینی مەبەستە شەرعیەکان و دەکرێت بە ئەو سەرچاوەیە هەژمار بکرێت کە لێیەوە حوکمڕانی و لقەکانی تری لێوە جیادەبێتەوە، تا زۆرێکی تر لەو جۆرە دەستبۆبردنانەی کە هیچی بۆ چەمکەکە زیاد نەکرد، جگە لە زیاتر ئاڵۆزکردنی نەبێت.

بینیمان چەمکی حوکمڕانی کە زۆرێك لە گرووپە سیاسیە هاوچەرخەکان بنیاتیان لەسەرناوە، لەبری ئەوەی بیکەنە چەمکی زیندووکردنەوە و نوێگەری کە توانای هەبێت سەرلەنوێ ئەم گەلە یەکبخاتەوە و پینەی ئەو دارمانە بکاتەوە کە لە بناغەکەیدا روویداوە بکاتە چەمکێك کە جیاوازی و دووبەرەکی و لێکترازانی قووڵتر کردەوە و کاریگەرییە نەرێنیەکەی زیاتر کرد، هەروەها بووەتە کرداری

لەبیرچوونەوە، یاخود لەبیربردنەوەی بەها قورئانییە باڵا و بنەڕەتیـەکان کە وەستاوە لەسەر یەك خواپەرستی و پاککردنەوەی خـود و ئـاوەدانی و گەل و بانگەواز، پاڵپشت بە کۆتا پێغەمبەرایەتی و شـەریعەتێکی گشـتی، ناسـراو بـە ئاسـانکار و لابـەری دژواری و کۆتـو بەنـد و زۆرەملـێ و ستەمکاری، گشتگیری و جیهانیبوون، یەکبوون لە تێڕوانین و بیروباوەڕ و ئامانجـەکان، مەبەسـتە شـەرعیەکان، تـا هـەموو ئەمانـە ببەخشـێت بـەو جیهانەی کە زۆر ئاتاجیەتی، تـا لـە جـوانترینی ئـەو نموونانـە پێشـکەش بکات کە پێغەمبەرانی چاولێکراو و سەرمەشق پێشکەشـیان کـردووە بـەو پێیەی ئەو گەلێکە لە لوتکەدایە و وەسفکراوە بە چـاکترین و بـەمیانڕەو، توانای هەیە هەستێت بە ئەرکی بوون بە شایەت بەسەر هەموو خەڵکەوە، ئـا لێـرەوە دەسـتمانکرد بـە بینینـی نەهامەتیـەکی زۆر گـەورەتر لـە نەهامەتیـەکانی صـەلیبی و تـەتارەکان، ئـەویش خـۆی دەبینێتـەوە لـە خۆبـەهێزکردنی نـەوەکانی گـەلی موسـڵمان لەسەردەسـتی سەرسـەخترین دوژمنیدا بۆ دژایەتیکردنی براکانی خۆی، ئەمەش لـە دەرەنجـامی بـوونی ئـەو جیاوازیانـەوە سەرچـاوەی گرتـووە کـە لـەم چـەمکانەدا هەیـە، وای لێهاتووە موسڵمان زۆر بە ئاسـانی لـە ئایینەکـەی دەردەچـێت، بێئـەوەی هەسـت بکـات کـە ئـەو جێکـاری خـۆی بەجێهێشـتووە لـە نـاو ئیسـلامدا، پێیوایە عەلمانیەت پـارێزەری گەلـە لـە کوشـتار و شـڵەژان، چـونکە ئـەو گومانی وایە – یاخود وایان لێکردوە گومانی وابێت – کە ئیسـلام هیچـی پـێ نییـە جگـە لـە جیاکـاری و لێکهەڵوەشـان و هانـدانی گرووپێـك دژی گرووپێکی تر، یەکتر کوشتن و دژایەتی یەکترکردن و دانانی بۆمبی چێنراو

و تەقاندنـەوەی خـەڵکی بێتـاوان و کوشـتنی ژن و منـاڵ بـەبێ جیـاوازی، ئەویش دەرەنجامی جیـاوازی سیاسـی، یـان مەزهەبـە فیکریەکانـە، یـان بەریەککەوتنی بەرژەوەندیەکانە، یاخود لەسەر جیاوازی ئینتیمـا، یـاخود هەرشتێکی ترە.

ئێمەش لەم توێژینەوەیەماندا بانگەشـەی ئـەوە ناکـەین کـە دەسـتمان خستبێتە سەر هەموو لایەنەکانی باسەکە، بـەڵکو گرفتەکـەمان وروژانـد و هەنـدێك پرسـیارمان خسـتەڕوو، بـەڵکو ببێتـە هـۆی جۆشـدانی هزرەکـان لەسەر توێژینەوەی ئەم چەمکەو چاوخشـاندنەوەیەك پیایـدا لـەکاتێك بـۆ کاتێکی تر ، بەڵام لە چوارچێوەی حـوکمڕانی قورئـانی پـیرۆزدا، نـەك لـە هیچ چوارچێوەیەکی تردا.